

# گەردوناسی

## لەبەر سێبەری قورئان و زانست

چاپی دووەم

کۆکردنەوەو وەرگێڕانی

غەریب عەلی عەزیز

هەولێر ۲۰۱۲

# گەردوون ناسی لەبەر
# سێبەری قورئان و زانست



وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

ناوی کتێب: گەردوون ناسی لەبەر سێبەری قورئان و زانست

ئامادەو وەرگێڕانی: غەریب عەلی عەزیز

نەخشەسازی ناوەڕۆك: ئاری ئەحمەد

نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئال ئەمین

چاپی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر ٢٠١٢

چاپی یەکەم: ٢٠١٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٣١٣) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

بسم الله الرحمان الرحيم

هذا من فضل ر بی

پێشەکی بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان بەرێزان هەر لەو ڕۆژەوە کە ئادەمیزاد لەسەر ڕووی زەمین پەیابووە تاوەکو ئێستاش مرۆڤ بەچاوێکی حورمەت و پڕ بایەخ سەیری ئاسمان و ئەستێرەکانی کردووە، زۆر هەوڵی داوە کە هەندێك نهێنیان بزانێ جاران هۆی بەرێوە چوونی مرۆڤ – کشتوکاڵ و ئاژەڵ داری بووە، جا لەبەر ئەوە پێش هەموو شتیك هەوڵی زانینی وەرزەکانی ساڵی داوە تاوەکو ڕۆژەکانی خۆش و ناخۆشی ساڵ بزانێ لەگەرماو سەرماو تەڕو ووشکی، ڕۆژ و مانگەکانی بە نیشانە لەسەر دارو بەرد داناوە بۆ نموونە ئەو بەردەی کە لە ئەشکەوتی (شانەدەر) دۆزراوە–١٢– نیشانەی لەسەر بوو کە مێژووەکەی –٥٠– هەزار ساڵ پێش ئیمڕۆیە هەتا زەمانە هات ئەم زانستە بایەخدارانەی زۆر بو لەسەردەم بابلی بۆ زانینی ڕۆژەکانی ساڵ نیزامی شەستیان بەکار هێناوە واتە ساڵیان کردووە بە – ٣٦٠– ڕۆژ–، هەروەها پێنج ئەستێرەیان دیاری کردووە ( عەتارد، زوهرە، مەرخ، موشتەری، زوحەل)، هەروەها یۆنانی و ڕۆمیەکانیش هەولێکی زۆریان داوە ئیستا زۆر بەی ناوی ئەستێرەکان بەزمانی – یۆنانی یە، ئالەتی – قیبلەنامەو ئوسترلاب هەر ئەوان دروستیان کردووە، بەلام هەر زانایەی جۆرە بۆ چونەکی هەبووە لەبارەی خولانەوەی ئەستێرەکان تازەمانێکی درەنگیش ئەستێرەناسی بەزانستی (عیلم التنجیم) لە قەڵەم ئەدرا واتە بۆ فاڵگرتنەوە ئێستاش ئەم دیاردەیە هەرماوە کە زۆربەی ڕۆژنامەکان و بوورجەکان

دەنووسن هەرجالەی شتەکی دەڵێن هەر ئەو زانستە پاشان بووە (عیلم الهیئە) کە ئێستا زاناکان بەوردی دەیانەوێ لە نهێنی ئەستێرەکان بگەن (ئەم پەرتووکەش کەمن نووسیومەوە تەنها نامیلکەیەکی زۆر گچکەیە لەو بابەتە تەنها بۆ زانیاریی گشتی یەو بەس) چونکە تازانست پێش بکەوێ نهێنی زۆر تر ئاشکرادەبێ، هیوا دارم لەکەم و کورتیەکانم چاو پۆشی بکەن، وەمنیش لەلایان خۆمەوە چەندەها ساڵ بۆ ئەو مەبەستە هەوڵمداوە هەربەتەنیا نووسینەکەم لەناو پەرتووکەکان وەرنەگرتووە، جاری واهەبووە گوتویانە کەسێکی شارەزا لە فلأنەشوێن هەیە بەدوایدا گەڕاوم سوودم لێوەرگرتووە خۆشم تاقیم کردۆتەوە، دواجار سوپاستان دەکەم کەرێز لە بۆ چونەکانم بگرن.

مامۆستا غریب علی عزیز

# بەشی یەکەم

# ساڵنامەکان

## ساڵنامەی کوردی



ئوسترلاب



گۆی فەلەکی وێنەی
ئەستێرەکانی لەسەر کراوە

## پەیدابوونی ساڵ نامە و دروستکردنی

لەسەر دەمایەکی زۆر کۆنەوە ئادەمیزاد هەوڵی داوە کە ساڵنامە دروست بکات، هەنگاو بەهەنگاو هەوڵی خستۆتە گەڕۆلەکۆندا خەڵکی بەهۆی ڕووداو یاخود بەسەر هات مێژووی دیاری کردووە بۆ نمونە گوتوویانە ساڵی سەفەر بەلك، یان ساڵی گرانی گەورە، یان ساڵی بەفرە ئەستوورەکە، وەنەبێ وەرزەکانیان نەزانیبێ، بەڵی زانیو یانە، هەروەها زانیویانە ساڵ دوانزەمانگە بابلیەکان نەریتی شەستیان بەکار هیناوە،واتە ساڵیان کردوەبە –٣٦٠– ڕۆژ زەردەشتی لەسەر وەرزەکانی ساڵ ساڵنامەیان دروست کردووە. بۆزانینی وەرزەکانی کشتوکاڵی قووچەکە بەردیان کردووە بەنیشانە، زۆر شوێن لەکوردستان هەیە بۆ ئەم مەرامە بەکار هاتوون، لەدونیادا هەر نەتەوەیەك هەوڵی داوە بۆساڵنامە دروست کردن،ئینجا بۆ [redacted] مەبەستی ئاینی بووە یادونیایی گرنگ ئەوەیە هەوڵدراوە، ئیستا چەند نموونەی باسەکەمان بەووردی دەردەخەین.

## سالنامەکان

## مێژووی ساڵ نامەکان

## ساڵنامەی زاینی

مرۆڤ زۆر هەوڵی داوە کەحیساباتی ڕۆژانەی خۆی بزانیّ، جالەبەر ئەوە تێکۆشاوەکە بەهۆی شتێکەوە ئەم کارە بکات . زاناکانی کۆن هەموو هەوڵی خۆیان خستۆتە گەر بۆ ئەوە مەبەستە، هەنگاو بەهەنگاو باسیان دەکەین.

## ساڵنامەی میتۆنی:

میتۆن – ٤٣٣- ساڵ پێش زایین لە یۆنان ساڵنامەیەکی داناو کە خشتەکانی بەناوی زێر لەسەر بتەکان نوسیوە، ژمارەی -١٩- ی کردووە بەکلیلی ساڵنامەکەوە بەپێی ساڵنامەکەهەر ڕۆژەکی ساڵ سەری ساڵ بێت پاش -١٩- ساڵ هەر ئەو ڕۆژە دەبێتەوە سەری ساڵ، ئەم کارەی لەبەر ئەوەکردە کە ڕۆژانی جەژن نەگۆڕیّ.

## ساڵنامەی قەیسەری:-

قەیسەر- اغسطوسی یەکەم – کە ئەو نازناوەی هەڵگرتووە لەزگی دایکی دەبیّ دایکی دەمریّ دکتۆرەکان زگی دایکی دەدڕن وەبەساغی دەری دێنن، دواجار ووشەی قەیسەر بووە نازناوی هەموو پاشاکانی ڕۆم، ئەم پاشایە ساڵنامەیەکی داناوە بۆ یەکەم جار بەلاّم کەم و کورتی زۆری هەبووە.

## ساڵنامەی انطۆنیۆس:

قەیسەر انگۆنیۆس داوای لە – بطلیمۆس کردکە ساڵنامەی پێشوو دەست کاری بکات ئەویش هەستا بەزیادکردنی ڕۆژێك بۆ ساڵنامەکە، بەلاّم دیسان هەڵەی تێکەوت.

## ساڵنامەی یۆلیۆسی:

ئەم ساڵنامەیە لەلایەن– سیجینۆس– داندراوە–٤٥– ساڵ پێش زایین، بەلاّم دەرکەوت کەلە – ٤٠٠– ساڵ– سێ ڕۆژ جیاوازی ڕوودەدات.

## ساڵنامەی قسطنطین:

سەردەمی ئەم پاشایە بت پەرستی نما چونکە خۆی و دایکی – هیلینا– بوونە مەسیحی جالەبەر ئەوە داوا لە – دقلیانۆس– کرد کە لەسەر ڕۆژی لەدایك بوونی حەزرەتی عیسا ساڵنامەیەك دابنێ، بەلاّم دیسانەوە سەرەساڵکان جێگایان دەگۆرا.

## ساڵنامەی گریگۆری:

پاپا گریگۆر داوای لە – کلافسیۆس کرد کە ساڵنامەکە دەست کاری بکات، ئەویش هەستا بەگۆڕینی ڕۆژی– چواری اکتۆبەر بە ڕۆژی پانزەی اکتۆبەر، هەروەها ڕۆژێکی بۆساڵەکە زیاد کرد واتە هەر چوار ساڵ جارێکی کردە کەبیسە–٣٦٦– ڕۆژ، بەلاّم سەرئەنجام ئەویش کەمو کورتی تێکەوت.

زانا – ئەرملین– ئەمجارە بەپێی وەرزەکانی سالی کردە چواربەش، وەیەکی کانونی یەکەمی کردە سەری ساڵ و پێنج ڕۆژی ئاخنی یەناو مانگەکان، واتە شوباتی کردە– ٢٩– ڕۆژ هەرچوار ساڵ جارێك بەم جۆرە ساڵنامەی زایینی دانا کە تاکو ئێستاش پەیرەو دەکرێ.

## سالنامەی ڕۆمی:

ئـەم سـالنامەیە لەلایـەن- ئەسـکەندەری مەقـدۆنی دانـدراوە لـەو ڕۆژەی - قودسـی - داگیرکـردوە، تەمـەنی -١٧- سـالْ بـووە. پـێش ئـەو سـالنامەی - قبطی - باوبوە کەلەسەر بەدەرکەوتنی ئەستێرەی گەلاوێژ.

سالنامەی ڕۆمی حـەوت ڕۆژ پـێش سـالنامەی زایینـی یە، حیسـاب گـەرەکانی کوردسـتان زۆر ئـەم سـالْ نامەیـە بـەکار دەێـنن چـونکە لەگـەلْ کەشـوهەوای کوردسـتان لـەبارە،ناوی مانگـەکانی بـەم جۆرەیـە:- (بنواریـۆس، مرطیبـۆس، افلیروۆس، مایۆس،یۆنیۆس،یۆلیۆس،اغسگۆس،

بطریۆس، طبریۆس، نۆامبەرۆس، دمریۆس).

## سالنامەی جۆلیانی:

ئەم سالنامەیە زانایانی فەلەکی دایان ناوە بۆ مـەرامی خۆیـان - سـکالینجەر- لەسالی ١٥٨٢ ز - دایناوە وەسەرەتاکانی - سالی ٤٧١٣- پێش زاین دەست پێدەکات، واتە گەرسالی - ٢٠٠٠- ز وەرگرین بـەم حیسابە دەکاتـە سـالی - ٦٧١٣- جۆلیانی.

## سالنامەی قبطی:

ئـــەم ســـالنامەیەدەگەرێتەوە ســـەردەم فیرعەونـــەکان جـــاران ئـــیش بـــەم سـالنامەیەدەکرا لەسـەرتا سـەری جیهـانۆ سـالنامەکە لەسـەر بەدەرکـەوتنی ئەستێرەی - گەلاوێژ- داندراوە لـەولاتی میسر، وەسـەرەتاکەی لـە - ٢١-٨- دەسـت پێـدەکات، وەنـاوی مانگـەکان بـەم شـێوەیە: (تـووت، بابـە،هاتور، کهیك،طۆبة،أمشیر،برمهات،بەرمۆدە،بشنس،بەئۆنە، ابیب ،میسرا).

## ساڵنامەی عیبری:

ئەم ساڵنامەیە سەرەتاکەی لەوڕۆژە بۆ داندراوە کە حەزرەتی موسا لەدەریای سور پەریوە خودای مەزن لەفیرعەون ڕزگاری کرد. ساڵنامەکە بەدووشێوە داندراوە- عبور- بەسیطبةو مەرجەی نابێت سەری ساڵ ئەم ڕۆژانە بێت(یەك شەم ، چوارشەم، هەینی) ناوی مانگەکان بەم شێوەیە: (تشرا، مەرحشوان، کسلیول، طیبت، شفط، اژر، نیس، ایزە، سیوە، تەمز، اوب، ایلل) بەلاّم ئێستا ئەوانیش لەسەر ساڵنامەی زایینی دەڕۆن.

## مێژووی سەر هەڵدانی ساڵنامەی کۆچی

ماوەیەکی زۆرە عەرەبەکان لەسەر ساڵنامەی ئیسماعیلی دەڕۆیشتن، پاشان عەرەبەکان دەستیان بە – نەسیئ- کرد واتە لە چوارساڵێك ساڵ دەبووە سێزدە مانگ ئەو زانایانەی ئەوەیان دەکرد پێیان دەگوتن- قەلامس- لەوانە ئەبو پماما- کە ئاینی جولەکە پەیابوو هەر لەسەر شێوەیە دەڕۆیشتن. عەرەبەکان چونکە لەشەر و شۆرو ئاژاوەبوون بەم کارە جێگای مانگە موحەرەمەکانیان دەگۆری بەپێی بەرژەوەندی خۆیان.

ناوی مانگەکانیش بەم جۆرەبو:- (مئوتەمەر، ناجر، خووان، صوان، حنتم، زبای، اصم، عادی، نافق، واغل، براك)ئەو ناوانە لەندێ شوێنی تر ناوەکانیان دەگۆرا بەم شێوەیە:-

(نامق ، ثقیل ، طلیق، ناجر، اسلخ، امیح، احلك، کسع، زاهر، براك، صرف، نعش)هەروەها ناوی ڕۆژەکانی حەفتەش بەم جۆرە بوو:-

(اول، اهون،جوبار، دوبار، مئونيس،عروبه، شەمەلەدواوە داندراوڕۆژی بەتاڵ بـو. کـە ئـاینی ئیـسلام پــەیابو ئــەوانیش لەپێــشا مێــژوویان زۆربەکــەمی بەکاردەهێنابەتایبەت لە ژیانی ڕۆژانەدا، وەساڵەکانیان بەم جۆرەناو دەبرد:-
(ساڵی الاذن، ساڵی الامر بالقتال، ساڵی التمحيص، ساڵی الترفيه، ساڵی الزلزال، ساڵی الاستئناس، ساڵی الاستغلاب، ساڵی الاستواي، ساڵی البرئة، ساڵی الوداع). پاشـی ئـەوەی ئـەم ئايەتـە نـازل بـوو کـە خـودای مـەزن دەفەرمووێ:(انما النسيئ زیادەفی الکفر)موسلمانان کەوتنە ڕێك خستنی ناوی مانگەکان بەم شێوەیە:-
(محرم، صفر، ربيع الاول، ربيع الثاني، جماد الاول، جماد الثاني، جماد الاخره، رجب، شعبان، رمضان، شوال، ذی القعده، ذی الحجه) هەروەها ناوی ڕۆژەکانی حەفتەشیان دانا:- (السبت، الاحد، الاثنين، الثلاثاء ،الاربعاء، الخميس، الجمعه).
دیسانەوە بەکەمی بەکار دەهات تاسەر دەمی ئیمامی عومەر کەنامە دەنووسرا مێــژووی لەســەر نــەبوو نــەیان دەزانــی چ ڕۆژێــك نووســراوە، جـا لەبـەر ئەوەئەوانیش داوایان کرد کەساڵنامەیەکیان هەبێ. هەموو لایەك بڕیاریاندا لە -١٦-تەموزی - ٦٢٢- زاینی کەدەست بە دانانی ساڵنامەکە بکەن، ئەو ڕۆژە کۆچ کردنیان بۆ مەدینە سەری ساڵبێ بەڵام سودفەی کرد - ١٢- ربيع الاول- مـەجبور بـون کـە ئـەم جیاوازیـە چـاك بکـەن یەکـسەر مـانگی - محـرم- بکەنەسـەری ساڵی کۆچـی. ئـەم ساڵنامەیە لەسـەر حیسابی هـەلاتنی مـانگ داندراوە کە هەر ساڵەی دە ڕۆژدێتە پێش مانگەکانیش بەگوێرەی وەرزەکانی ساڵ شوێنیان دەگۆڕێ . دوای ئەم گۆڕان کاریە مێژوو لەسەر هەر نووسراوێك داندرا.

## ڕووداوەکانی مانگەکان:-

١- محرم/ ڕۆژی نۆیەم و دەیەمی تاسوعاو عاشورایە، هەر لەو ڕۆژە حەزرەتی موسا لەفیرعەون رزگاری بوو.

٢- صفر/ لەو ڕۆژەوە پێغەمبەر لەلایەن خودا فەرمانی غەزای پێدرا. دووی مانگ چەژنی ئەمەویەکانە ، هەرلەو ڕۆژە کەعەباسیەکان سەرکەوتن سەری ئیمامی حوسێنیان هیناوە لای لاشەکەی .

٢٣/ی مانگ ڕۆژی سەرکەوتنی عەباسیەکانەبەسەر ئەمەویەکان.

٢٤/ی مانگ پێغەمبەر چۆتە ئەشکەوتی (حرا ء)

٣- ربیع الاول/ یەکێ مانگ دەرگای خێرات دەکرێتەوە... ١٠-ی مانگ پێغەمبەر ژنی هێناوە...١٢-ی مانگ ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەرە.

٤- ربیع الثانی/ ٤ی مانگ حەجاج ئاگری لەشاری مەکە بەرداوە،١٤،ی فەرزی نوێژکرا ،٢٥،ی غەزەوات دەستی پێکردوە.

٥- جمادی الاول/٨ی مانگ لەدایك بوونی ئیمامی عەلیە،١٢،ی شەری جمل ڕویدا.

٦- جماد الاخر/....

٧- رجب/ ٢٧ی شەوی ئیسراو میحراجە، ١٢ ی وەلادەتی ئیمام جەعفەر سادقە ٤-ی حەزرەتی نوح سواری پاپۆرەکەی بووە،١٥ی دوعا لەو شەوە قبوڵە.

٨- شعبان/٣ی حەزرەتی حوسێن لەدایك بووە،٤ی ولادەتی حەزرەتی حەسەنە،١٥ی شەوی بەراتە ،١٦ی قیبلەی موسلمانان لەقودسەوە گۆرا بۆ مەکە

٩- رەمەزان/ فەرزی ڕۆژوو کراوە،٧ی تەورات بەخەڵات دراوە بەحەزرەتی موسا،٨ی ئینجیل بەخەڵات دراوە بەحەزرەتی عیسا،١٩ی شاری مەکە فەتح کراوە،٢٥ی دەوڵەتی عەباسی دامەزراوە. هەر لەو مانگە قورئان هاتۆتە خوار.

١٠- شوال/ لەو مانگە هەنگوین بەخەڵات دراوە بەمێش هەنگ لەبەر ئەوە خۆی بەگەورەنەزانیوە،١٧ی شەڕی ئوحودەو شەهید بوونی ئیمامی هەمزەیە ،٢٥ی قەومی عاد لەناوچوون.

١١- ذی القعدة/ لەو مانگەدا حەزەتی موسا،٣٠ی ڕۆژی بۆ داندرا بۆ ئەوەی دەستوراتی خودایی وەرگری پاشان خودای مەزن کردیە چل ڕۆژ ،٥ی حەزرەتی ئیبراهیم دیواری کەعبەی دروست کردووە،١٤ی حەزرەتی یونس لەناو زگی حوت دەرباوی بووە.

١٢- ذی الحجة/ ١ی فاتیمەتولزوهرا شوی بەئیمامی عەلی کردوە،٨ی لەو ڕۆژی خەمی ئاو دابین کردنی حاجیان بووە،٩ی عەرەفەیە،١٠ی جەژنی قوربانە،٢٦ی خودا لەحەزرەتی داود خۆش بوو،٢٨ی ڕۆژی خەلافەتی ئیمامی عەلیە.

- لەسەردەمی عەباسیان ئەستێرەناسی زۆرپێش کەوت بەتایبەت سەردەم- مأمون- چەندین ڕوانگە لە- هەولێر- مەراغە - دینەوەر، بروجەر، ئامەد، خورئاسان، شاخی سەهەند، داندرا. لەسەردەم موستەنسیر بیلا زۆر پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی.

## ساڵنامەی تورکی

شاری ئەستەنبول پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بووە، جا لەبەر ئەمە وەکو ساڵنامەی زاینی لەسەرەتای زاستانەوە دەست پێدەکات، وەناوی مانگەکان بەم شێوەیەداندراوە:-

(ئۆجاك، شوبات، مارت، نیسان، مایس، حوزیران، تەموز، اب، ایلول نکیم، ئلغ ئای، کچك ئای، برینجی ئای، یەکنجی ئای، ئالتنجی ئای، باشنجی ئای،سکسنجی ئای، دوقسنجی ئای ،ئۆننجی ئای، تورتنجی ئای، بێجنجی ئای ئینجئای).

## ساڵنامەی فارسی

لەدانانی سەرەتای ساڵنامەی فارسی ئەفسانەو راستی تێکەڵە، هەندێ مێژوونوسی کۆنی ئێرانی دەبنەوە سەر کیومەرث (گلشا)کە بەیکەم مروڤی سەرزەوی دادەنرێن،سەجەرەی هەموپاشاکانی ئێران دەبنەوە سەری، سەرەتای دونیا دەبەنەوە پێش- ١٢- هەزارساڵ هەندێکی تر لەناو چونی - داریوش- بەسەرەتا دادەنێن. هەندێکی تر لەحوکمرانی- ئەردەشێری بابەکانەوە دەست پێدەکەن. دوایین مێژو نوس سەرەتاکەی بە لەناو چوونی - یەزدەگردی کوری شەهریار دەست پێدەکەن. ئەو ساڵنامەیەی ئێستا کەلەسەری‌تەقویمی نەورۆزی داندراوە واپێدەچێ سەردەم ئاینی زەردەشتی ناوی مانگەکان داندرابێت، مانگەکان بەم جۆرەن:- (فەردوین، ئۆردی بەهەشت، خورداد، تیرماە،بەهمەن،ئەسفەند، سەرەتاکەی لەمانگی نەورۆزی بەهار دەست پێدەکات کەلای گەلانی ئیران زۆر پیرۆزە- )

١- سەرەتای ئاودانی دونیایە
٢- ئەستێرەناسان دەڵێن ئەستێرەی بەخت- موشتەری - خودا دروستی کردوە.
٣- کاوەی ئاسنگەر توانی کۆتایی بەزولمی - ئەژدیهاکی زۆرداربهێنێ
٤- حەزرەتی سلێمان ئەنگوستیلەکەی دۆزیەوە کە- سەخری- جن دزیبووی
٥- پاشایی ئەفسانە جەم توانیویاتی بەسەر شەیتانەکاندا سەرکەوێ کەبەری باو بارانیان گرتبو گرانیان بەسەر دونیاداهێنابوو.
٦- شەوی نەورۆز دوعاقبول دەبێ.
٧- شەوی نەورۆز مەلائیکەتی رەحمەت دێنە سەرزەوی بەرەکەت دەرێژینن.

## ساڵنامەی کوردی

ئەم ساڵنامەیە/ ٧٠٠- ساڵ پێش زاینەوە دەست پێدەکات، واتە ساڵی - ٢٠٠٠ ز دەکاتە ٢٧٠٠ کوردی کەلەسەر وەرزەکانی ساڵ داندراوە، سەرەتاکەی لەمانگی نەورۆزەوە دەست پێدەکات،بەڵام لەهەرناوچەیەکی کوردستان ناوی مانگەکانجیاوازی بەخۆوەدەبینی، هەندێکیان دەخینە پێش چاو:-

* کوردستانی عێراق: (نەورۆز- گوڵان- جۆزەردان- پوشپەر- خەرمانان- گەلاوێژ- رەزبەر- گەلارێزان- سەرماوەز- بەفران بار- رێبەندان- رەشەمە.
نەورۆز، خاکەلێوە،گوڵان، بانەمەر، گەلاریزان، خەزەلوەر، رەشەمە، بازبەران.

* کوردستانی ئێران: نەوسان(بارانان،جێژنان)، گولاّن(هەواران)، زاردان(باران بران)، گڕان(نۆنەخشان) ()سۆران(هەنگوان)، بەران، وەران،ساران(ئاوران، خوساران)،بەفران، بەندان(چلان)، بەران، وەران، ساران(ئاوران، خوساران)،بەفران، بەندان،(چلان)، پۆلان(مشکین نام).
* مانگەکانی جەلالەدین ئاراڵەساڵنامەکەی: چیمەن ئارا،گولئاوەر، جان برور، گەرماخیز، ئاتەش بیز، جانبەخش، دژم خۆیی، باران
ڕێز،ئاندۆگین،سەرمادە،بەفر ئاوەر، مشکین نام.
* مانگەکانی ئاڤێستای: (فروتی، ئارت، هائۆرنات، تیشتری، تامرتات، خشتهاوەر، میترا،ئابان، هاتوش(جزوە))وەهۆمەند، سەعدئارمز.
ساڵنامەی زەردەشتی ١٧٣٨ ساڵ پێش زایینەواتە ساڵی ٢٠٠٠ دەکاتە ٣٧٣٨ زاردەشتی.

## مێژووی ئەستێرەناسی لەکوردستانی عێراق

گەلەکەمان خاوەن شارستانیەتەکی گەورەیەلەهەمو بوارێکدا،هەمیشە زاناکانمان لە ڕیزی پێشەوە بوون. زانستی ئەستێرەناسی جاران لە هەموو حوجرەیەکی فەقێیان دەخوێندرا مەلا ئیجازەی نەدەدرایٚ گەر ئەم عیلمەی نەزانیبا، چەنکە دەبوایە مەلای گوند هەمو کاتی فەرزەکان و جەژنەکان و مانگەکان و موناسەبەکان بزانیٚ، جالەبەر ئەوەزاناکان زۆر هەولی فێربوونی ئەم زانستەیان داوە، نمونەی زانایانزۆرە تا جارێکیان کۆمەلێك قەشە دەیانەوەیٚ شێخی بریفکان تاقی بکەنەوە لیی دەپرسن ئایا خودا دەرەجەی بۆ ئاسمانەکان داناوە ئەویش یەکسەردەفەرمویٚ(رفیع الدرجات)بە حیسابی ئەبجەدی دەکاتە ٣٦٠ دەرەجە قەشەکان بێدەنگ دەبن. لەقەدیم وتراوە

کەمەلایەکان وەعزیان خوێندۆتەوە بۆترساندنی خەلکی ووتویانە کە دونیا لەسەر پشتی گاو ماسی ڕاوەستاوە ئەگەر خەڵکی تۆبە نەکەن ئەوا ماسیکە خۆی دەجولێنێ گایەکەی سەرپشتی جێی لەق دەبێ و دونیا تێکدەچێ، وەنەبێ زاناکانی کورد ساویلکەبووبن لەحیسابی بورجەکان بەلاّم گەر مەلا باسی ئاسمان و بورجی بکردایە دەیانگوت دەستی لەکاری خوداداوە مەلایان شار بەدەر دەکرد چونکە خەڵکەکە زۆربەی هەرە زۆری نەخوێندەوار بوون لەمەقسەدی مەلانەدەگەیشتن کە بەلی خودای مەزن دوازدە بورجی بۆ ئەستێرەکانی ئاسمان داناوە لەوانە بورجی– گاو– نەهەنگ– کەتەنها بورجی – حەمل– لە نێوانیان دایە کە ئەو سێ مانگەی ئەو بورجانە هەڕەتی باران بارین و ئاو زۆریە. زۆرجار مانگ یان خۆر گیراوە گوتویانە گوایە کەوتۆتە ناوزاری نەهەنگ دەست کراوە بەدۆڵ و دەفە لێدان زکرکردن یان تەقە بەئاسمانە هاوا هاوار ئاخیر زەمانە، بەلاّم کەلەی بکۆڵیەوە زۆرجار کەمانگ و خۆر گیراوە خۆر لەبوورجی – نەهەنگ بووەکە ڕووداوەکە ڕووی داوە، بەلاّم زانایاکان نەیان درکاندوەلەبەر ئەم حەدیسەی پێغەمبەر دەفەرمووێ:(کلم الناس قدرعقولهم) دوزانست هەیە لەم بارەوە یەکیان :علم تنجیم–ی پێدەوترێ کەیەهۆی کەلوەکان زۆر فرەوان دەکات لەباسی گەورەو بچوکە ئەستێرەکان و دوورونزیکیان کەتاکو ئێستاش لێکۆلینەوەی زانایان هەربەردەوامە. لەکوردستان زاناکان گەلێك ڕوانگەیان داناوە کەتاکو ئێستاش پەیرو دەکرێت، لەچاندنی کشتوکاڵ و هاتنی سەرماو گەرما، لەو ڕوانگانە:–

١- ڕوانگەی باری گچکە - مەلانەبی- لەساڵی - ١٥٠٠ز لەسێوەیل لە داوێن سورکێودایناوە.

٢- ڕوانگەی شاربازێر، کەمامۆستا شێخ عەلی کۆسە دایناوە.

٣- ڕوانگەی- کانی تو- لە شاخی- هێلانەقەل- لەبەری مەرگە- بنەماڵەی مەلا رئوف حیسابیان پێکردوە.

٣- روانگەیکەلیخان لەگوندی سونگ دامەزراوە لەگەل حیسابی- کێلەشینە.

٤- روانگەی گردە سۆری لاجان.

٥- روانگەی گلەزەردە- کە شێخ حەسەنی گلە زەردە دایمەزراندوە.

٦- روانگەی - گوندی گراو - لەشاخی پیرمام-

گونـدی - گـراو- کەوتۆتـە رۆژ ئـاوای - سـەری ڕەش - لـەناو دۆلێکدایـە لەوەختی خۆی بنەماڵەی - مەلا عبدولای گەورە شوێنەکەیان ئاوەدان کردوە کەزانایەکی گەورەبووە پشتاو پشت نەوەکانی زانابوون، لەوانە، مەلا هۆمەر ڕوانگەیـەکی دانـاوە لەسـەر شـاخی لولکان،کـە چـەندین نیـشانەی قوچـەکی بـەردی بـەگویرەی کـەلوەکان دانـاوە. ڕوانگەکـە لـە کـورترین رۆژسـاڵ دەسـت پێـدەکات وە لـە درێـژترین ڕۆژی سـاڵ کۆتـایی دێـت. ئەسـتێرەی - پێـرو- و خۆری کردوە بەقیاس بۆ ئەم سەرو ئەوسەر، بەم شێوەیە:

١- گەر- خۆر / لەسەر قوچەکی تەرازو ئاوابو مانای کۆتایی زستانە.

٢- گەر- خۆر/ لەسەر قوچەکی پێرو ئاوابو مانای هاوینەو کۆتایی بەهار

٣- گەر- خۆر/ لەسەر قوچەکی - گەلاوێژ- ئاوابو مانای نیوەی زستانە.

٤- گەر- خۆر/ لەگەرانەوە گەیشتە سەر قوچەکی تەرازو مانای پایز.

٥- گەر- خۆر/ لەگەرانەوەدا بەسەر قوچەکی تەرازی ئاوابو نیوەی پاییزە.

یەکەم قوچەکی روانگەکە کەلوی- جەدیە- کەدەکاتەسەری زستان و کورترین ڕۆژ.

لــەویوەو ووردە ووردە خــۆر بــەرەو هــەوراز دەرواتــا دەگاتــە قوچــەکی کەوان(القوس) بەماوەی -٢٥- ڕۆژ ئەم جارە حیسابی چلەی زستان دەست پێـدەکات کـە چـەند قوچـەکەکیان بـۆ کـراوە ئـەمجارە بـەم شـێوەیە- بێنـد* بێندرخە* مێرەمئۆغەن* پێت و پارۆس* خدر ئیلیاس. ئەمجار چلەی زستان تـەواو دەبـێ وەپـاش - ٢٥- ڕۆژ بـەهار دێـت، وەلـە -٢٥- شـوبات ڕەزبـرین دەست پێدەکات(ئەو حیسابە لەگەرمێن حەوترۆژ پێشتر کۆتایی دێت).

خۆر هەر سەر درکەوێ بەرەو بەهار دەروا، لەسەر قوچەکی حەمل ئاوادەبێ، ئـەم جـار رو لـە قوچـەکەکانی - کـەلوی گـا- و جیـوك تێدەپـەرێ تادەگاتـە قوچەکی قرژاڵ وەلەوێ کۆتایدێت وەدەبێ بەهاوین، پاشان دیسان خۆر بەرەو خوار دێتـەوە وردە وردە کات کورت دەبێت تادەگاتە کورترین ڕۆژی زستان. قوچەکی کەلوی تەرازو لەروانگەکە لە هەلکشانی خۆر دەبێتە دەستپێکردنی ڕەز بـرین، لەگەرانـەوەی خـۆروە ئـاوابونی لەسـەر ئـەم قوچـەکەکاتی تـۆدانی گەنم و جۆیە.(وێنەی ساڵنامە)



ئوسترلاب



گۆی فەلەکی وێنەی
ئەستێرەکانی لەسەر کراوە

## تێبینیەکانی خەڵکی کوردستان لەسەر کەش و هەوا:-

١- گەر مێگەلە مەڕ لەهاویندا خۆی لەپاڵ یەك کۆکردەوە دەڵێن زستانی تووش دەبێ.

٢- حیساب گرەکان چلەی زستان لەگەڵ چلەی هاوین بەراورد دەکەن عەکسی دەکەنەوە ئەنجامەکەی راست دەر دەچێ.

٣- ئەگەر سەرە پەڵە هەور زۆر گرماندی دەڵێن ساڵ بەری هاویشت واتە ساڵ کەم باران دەبێت.

٤- هەر ساڵ بەهار بارانی کەم بێت شینایی لە هاوینبەزەحمەت تێر ئاو دەبێ.

٥- گەر چلەی هاوین بەردێکت هەلداوە لەشاخی بنی ئارەقەی کردبوو ئەوا زستان سارد دەبێ

لەکوردستان سێ جۆر ئەستێرە حیسابی پێدەکەن - پێرو ، تەرازوو، گەلاوێژ- گەر پێرو هەلات مانایی سەرەتایی هاوینە، پاشان هەردیار دەبێت کە ئاوابوو مانای زستانە، خەلك دەچنە راوە حەیوانەکێوی.

گەر سێ ئەستێرەکەی تەرازو دەرکەوت مانای پایزە.

گەلاوێژ دەرکەوت مانای دونیا فێنك دەبێ. هەرەتی مێوە پێگەیینە.

گەلێ زاناو حیسابکەر لە کوردستان هەبون کەلەم زانستە شارەزابوون وەکو ئەبو حەنیفەی دەنەوەری ، شێخ عەلی کۆسە ، مەلا حسێنی پژدەری موحەمەدی ئەخلاتی، سێبغەتولای حەیدەری ، شەمسەدینی شێروانی، شێخ حەسەنی گلەزەردە، سەعرت سەدردین، مەلا ئەحمەدی سەردریی ، ئیبن رەزازی جزیری ، مەلامستەفای پلنگان، فەخری مەراعی، حەسەن گابەگ

مەلا نەبی ، ئیبرایمۆك كچەكەی، مەلا عەبدوڵای گراوی ، بنەماڵەی سەید رئوفی كانی توو، سەرسیانی و دەیانی دی.

## سەرچاوە سرەكیەكانی ئەم بەشە:-

١- گۆڤاری رۆشنبیری - ١٩٨٤ ، ٢٨٨، عبدالرقیب یوسف
٢- الاثار الباقه فی القرون الخالیه، جدول الشهور من صحیفه،٥٥، الی ص٢٣٠ البیرونی ، الخوارزمی
٣- گۆڤاری ئاوێنەی ساڵی ،١٣٦٨، هەتاوی ل، ٢٧ ،دكتۆر عبدولای ئەیوبیان

## ساڵنامەی کشتوکاڵی

لەبۆ ئەوەی کوردستان ناوچەیەکی کشتوکاڵی یە لەبەر ئەوە خەڵکەکە زۆر بەوردی چاودێری کاتەکانیان کردووە واتە چ وەختێک باشە بۆ چاندنو دورینەوە هەر وەها چ وەخت باشە بۆ مێوەجات.

١- چاندنی سەوزەوات ، توور، لەسەرەتای مانگی نۆ زۆر باشە هەم سەرك دەکات ، هەم شیرین دەبێت. تەرەتولە، هەمووده‌م، سلّق، چلەکان و بەهار نەبێت چاندی باشە پەلکی گەورە دەبێ. کەرەوز، بە ١٤ ڕۆژ سەردەردێنێ گەرجێی نەرمان و زبڵ کرابێ بەلاّم دەبێ داپپۆشی.

٢- گندۆرەو شفتی، گندۆرەی دێمی لەمانگی سێ تۆدەکرێ ، لەگەڵ شفتی ئاخری بەهر دەچێندرێ تەرۆزی، لە مانگی سێ لەگەڵ گندۆرە دایە. بەلاّم چاربێستان لە ٧/١٠ دەکرێ.

٣- گەنم و جۆ، پاش باران پەلەگیا شین بو زەوی دەکیلّن بۆ ئەوەی گیایەکە بمری، ئەینجا تۆدەکرێ. زووتر پێدەگات ووتراوە(نیسان ناچێ بێ جۆ، ئادار ناجێ بێ دۆ) هەروەها ووتراوە دەغلّ ئەو لادی چل شەوە. نیسك و نۆك، پاش ٣/١٥ دادەچنرێ، گەر نۆك درەنگتر بچێندرێ کرمە سوتکەی هەڵدێنێ.

## گوتەی پێشینان:

لەکۆتایی مانگی نیسانێ ، گیشە لەعەردی کلۆ لە ئاسمانێ
نیسان لەگویم خۆشدێ خڕەی داسان ، گەر لێرە نەبێ لە خوراسان
یەك بارانی هەوڵی نیسان، نادەم بەموڵکی خۆراسان

٤- چاندنی پەمۆ، گوتراوە کفرە گوێ مشکە پەمۆ سەرپشکە، واتە ئەو وەختەی کەکفر پەلکی دیاردەبێ پەمۆ دەچێنن.

## هەندێ تێبینی خەڵکی:

١- نیشانەی باران بڕان گوڵە ئەستێرۆکە پەیادەبی.

٢- گەر پەڵە لەمانگی (نۆ و دە)کەوت بەتەواوی ساڵەکە ئاوی زۆر دەبێ و بەرەکەت دەبێ، وەکو ووتراوە پەڵە کەوت خەرمان کەوت.

٣- گەر هەنار گوڵی کرد ئاگاداربەمیش شەغرەدەکات، گەر بەری خڕنوک سوور بو مێش دەبڕێتەوە.

٤- نیشانەی پایز قامیش گوڵدەکات.

٥- کاتی ڕەز بڕین مانگی مارتە

٦- گەر گەلاوێژ هەنگوت ڕەنگی سەرەوەی پەلکی دار دەگۆڕێ.

٧- گەر مانگی نۆ یان دە دارێك بەڕەگەوە بچێنی بەهاری زۆر بەهێزدەبی وەساڵێك پێش وەخت بەردەگرێ.باسی (پیرو و تەرازو وگەلاوێژ) دواجار لەسەری دەڕۆین.

(سەرچاوەی ئەم باسانە لەچەند جوتیارێکی شارەزا بەتایبەت بەڕێز کاك قادری عەلی ڕەش)وەرگیراوە.

# هەسارەکانی خۆر



## خۆر و هەسەرەکانی

بسم الله الرحمان الرحيم* لخلقُ السماوات والآرض اكبر من خلق الناس ولكن اكثر الناس لايعلمون* ٥٧ غافر

واتە دروست کردنی ئاسمان و زەوی لەلایەن خودای مەزن گەلێك لەدروست کردنی مرۆڤ و گیانلەبەر مەزنترە.

ئەوەی کە بۆزانایان دەرکەوتووە تاکو ئێستا لە بۆشاییەکانی ئاسمانەکان ئەوەیە کەملیۆنەها کەشکەلأن و ئەستێرەی زەبەلاح و بچووك و ئەستێرەی کوژاوەو، خۆرو ئەستێرەی کلکدارو، شوێنی تاریك و ملیارها پارچە بەردی بچووك و گەورە پاشماوەی لەناو چووی ئەستێرەکانن، هەروەها ئەستێرەی گەڕۆك و مانگ هەیە, گەرانی زاناکان بەردەوامە بۆ دۆزینەوەی زیاتر لەم بارەوە.

## خۆر یاخود ڕۆژ

خۆر سەرچاوەی ڕوناکی و گەرمییە واتە سەرچاوەی ژیانە لەسەر ڕووی زەوی کەوتۆتە نێو ڕێگای کاکێشان بەدووری – ٣٥– هەزار ساڵی ڕوناکی دوور لە چێوەکەی، واتە نەکەوتۆتە ناوەندی تەواوی . خۆر نزیکەی –٩٣– ملیۆن میل یان– ١٥٠– ملیۆن کم لەزەوی دوورە، خێرای تیشکەکەی ٣٠٠ هەزارکم لەیەك تروکەدا، واتە هێزی تیشکەکەی بە ٨ چرکەو ١٢ تروکە دەگاتە سەر زەوی.

تیرەی خۆر نزیکەی – ١/٤– ملیۆن کم مەزندە دەکرێ واتە –١٠٩ – جار لەزەوی گەورەترە. خۆر رەنگی سپی و زەردە چونکە تەنی کالیسۆمی بەزۆری لەناو تیشکەکە دا هەیە. خۆر وەکو ئەستێرەکانی تر هەردەم لە خولانەوەدایە

بەگشتی لە نێوان ٢٥ تا ٣٠ ڕۆژ ٣٠ ڕۆژ یەك خول ئەدات بەخێرایی ١٩ میل لەیەك تروکەدا. زانایەکی یابانی لەدانیشگای – تۆکیۆ– سەلماندی کە خۆر قەبارەی هەیە بەدووری ٩٠٠ هەزار تا– ١/٥ ملیۆن میل لەخۆی . پلەی سەر ڕووی خۆر ٦ هەزار پلەی سانتیگرادە تابەرەو ناوەوە بچین گەرمیەکە زیاد دەکات تا دووملیۆن پلە.

## ڕەنگ و شەپۆلەکانی خۆر

تیشکی خۆر لەحەوت ڕەنگی سەرەکی دروست بووە کەهەریەکیان وەکو باوشە چلیکەدارێك وانکە زۆر لەتالە ئەزوو باریك ترن. زانا ،فومنۆر، بەهۆی سترۆسکۆبێکەوە بۆی ئەرکەوت کەهەر یەك لەم تاڵە تیشکانە سێبەری خۆی هەیە ، هەروەها لە نێوانیاندا شەپۆلەکانی تیشك تێدەپەڕێ کەهەر یەکەیان بەپێی پیتەکانی ئەبجەدی ناوی هەیە وەکو:(ئەلفا، بێتا،گاما، دیتا،زیتا،ئێکس) تەنها دوولەمانە باس دەکەین

١– شەپۆلی(ئێکس)ئەمە تەنی ڕەق نابرێت جەلەبەر ئەمە بۆ کاری پزیشکی بەکاردێت.

شەپۆلی (گاما)کە پاش ٣١ چینی بەرگە هەوا دێت شەپۆلێکی رادیۆمییە کە لەناویا شەپۆلی ، کۆسمۆکریز هەیە کەدەتوانێ شەش مەتر رەساس بسمێ.

## ڕەنگەکانی تیشکی خۆر:

١- ڕەنگی شین: ئەم شەپۆلە زۆر کورتە جا لەبەر ئەوەی گەر بەر دنکەکانی تۆزو هەڵمی ئاو بکەویٚ دەشکێتەوە، جاهەر لەبەر ئەوەیە کە ئاسمان هەردەم ڕەنگی شینە

٢- ڕەنگی سوور: بەشێکە لە ٣٣ هەزار بەشی یەك گریٚ.

٣- شەپۆلی مەیلەو مۆر: کەشەپۆلی ژێر سووری تێدایە کە خێراترین و درێژترین شەپۆلە بۆ وێنەگرتن سوودی لیٚ وەردەگیریٚ.

٤- ڕەنگی وەنەوشەیی: کەبەشێکە لە ٦٦ هەزاربەشی یەك گریٚ.

٥- ڕەنگی زەرد: بەشێکە لە ٤٠ هەزار بەشی یەك گریٚ.

٦- ڕەنگی پرتوقاڵی.

٧- ڕەنگی کەسك : مادەی کرۆلۆفیل لەناوی هەیە .

* خۆر تاکو ئێستاش هەر لەتیشك و ڕووناکی بەردەوامە، ئەو وزەیەی کەلە یەك ترۆکەدا فڕێی دەدات بە ٤٠٠ هەزار تەن ووزە مەزندە دەکریٚ.

تەنها بەشێك لەدووملیۆن بەش دەگاتە زەوی.

خۆر هەردەم خۆی نویٚ دەکاتەوە هەڵدەچیٚ، بەڵام هەرجارەی لەشوێنێك ڕوو دەدات بۆ نمونە ساڵی ٢٠٠٠ هەڵچوو زاناکان ناویان نا نوا ٩٢٩٣ کەتەقینەوەیەکی زۆر گەورە لە ڕووبەرێکی زۆر گەورە روویدا کەبەقەدەر ١٣ ئەوەندەی ڕوبەری زەوی بوو ووزەی تەقینەوەکە بەقەدەر هەزار ملیۆن تەن لەمادەی تەقەمەنی مەزەندە دەکرا لە ئەنجامی هەڵچوونەکە ڕەشەبایەکی گێژێلۆکەیی بەرپابوو، کەلە ناوەوە تەنی ئۆکسیدی تیتانیۆم و مەغنسیۆمی سورانەوەی ئەم گەردەلولە هێزێکی گەورەی کارەبایی دروست بوکە هەرچی ئامێری کارەبایی دەنگ هەبو گۆڕانی بەسەر داهات. دوو دیاردە هەیە کە

پەیوەندی بەخۆرەوە هەیە، یەکەمیان هەسارەکان هەر هەمویان بەنەریتێکی زۆر وورد بەدەوری خولدەدەن، کەپانی شوێنی فەلەکیان لەنێوان ١١ تا ١٢ کات ژمێری ڕوناکیە بەهەموان، واتە پانی هەسارەکە هەمووی.
(الفلك العام اسره الشمس ص –٢٣٠– ت / عبدالحميد سماحه* گۆڤاری خاك ٢٠٠١/٩/٢٢ * النجوم فی مسالكها عبدالسلام الكردانی ص ١١٤–١٢٠)

## خڕۆکەی زەوی

ئەو پارچە زەویەی کە ئێمە لەسەری دەژین لە بەشێك وشکانی و سێ بەش ئاو پێك دێت، ملیارەها ساڵ لەمەو بەرەوە هەر هەیە، لەچەشنی ئەنگوتکەهەویرێکی پان بۆ وەدەچێ کەپشتێنەکەی تیرەی زیاترە لە تیرەی هەردوو جەمسەرەکەی بەزیادەی -١٧- میل، پشتێنەی زەوی تیرەکەی -١٢٧٥٦- کم مەزندەدەکرێ. زەوی هەردەم لەخولانەوەدایە بەخێرایی ١٨ میل لەیەك تروکەدا کاتێکا کەبەدەوری خۆی خول دەدات لەماوەی -٢٤- خولەك شەوو ڕۆژ پەیدادەبێ، وەکاتێك بەدەوری خۆر خولدەدات لەماوەی ٣٦٥ ڕۆژ چارێك وەرزەکانی ساڵ پەیادەبێت. زەوی دووجەمسەری هەیە جەمسەری باکوور جەمسەری باشوور، جمسەری باکوور بەرامبەر ئەستێرەی - جەدییە- بەڵام جەمسەری باشوور لەبەر ئەوەی کە زەوی بەلاری ٢٣/٥ پلە خولدەدات چەقەکەی یەکشوێن نییە،بەڵکو بە شێوەی لەرینەوە (ترنح) دوو لە چەقەکەی دەسوڕێتەوە، ئەو نەریتەی کەزەوی پەیرەوی دەکات وای کردووە کە ژیان لەسەر زەوی دروست ببێت وە خودای مەزن دەفەرمووێ:

(والارض بعد ذلك دحاها *٣٠* اخرج منها مائها ومر عاها *٣٣*نازعات )

ڕووبەری زەوی بە ٥٠٠ ملیون کم$^{٢}$ مەزندە دەکرێ توێکڵی زەوی لەنێوان- ٣٠- ٤٠ کم دایە کەتا بەرەو ناخی زەوی بڕۆینە خوار گەرمایی ناو زەوی زیاد دەکات، بۆ هەر میلێك بۆ خوارەوە ٥٠ پلەی فەهرە نهایتی زیاد دەبێت لەم ئایەتە ئاماژەی پێکراوە:

(انك لن تخرق الارض ولن تبلغ الجبال طولا - الاسراو ٣٨)

لەبەر ئەو هۆیە زەوی بە پێی خولانەوە شوێنەکەی بەرامبەر خۆر دەکرێت بە پێنج هەرێم، هەرێمی گەرم کەبە هێلی ئیستوا ناسراوە، دووەم دووهەرێمی فێنکی باشورو باکوور، سێەم دووهەرێمی ساردی باکوور و باشوور.

## وەرزەکانی ساڵیش بریتین لە:

وەرزی بەهار: سەرەتای ئەم وەرزە لەو کاتە دەست پێدەکات کە خۆر دەکەوێتە سەر هێلی سفری ناوەند (خط الاستواء)شەوو ڕۆژ یەکسان دەبێت، پاشان وورده وورده خۆر بەرەو باکوور دێت، واتە لە ٢١ مانگی مارتەوە تا ٢٢ حوزیران ماوەکەی -٩٢- ڕۆژو -٢١- خولەکە.

وەرزی هاوین: سەرەتای هاوین لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکات کە خۆر لەکۆتایی کەلووی قرژاڵە واتە -٢٢- حوزیران، ماوەکەی -٩٢- ڕۆژو -١٤- خولەکە.

# دورة الارض حول الشمس والفصول الأربع

بە یابوونی وەرزەکانی سال



وەرزی پایز: ئەم وەرزە لەوکاتە دەست پێدەکات کە خۆر لەگەرانەوەیدا تەرازو دەبێت لەسەر هێلی ناوەند(خط الاستواء) واتە – ٢٣– ئەیلول سەری پاییزە ماوەکەی –٨٩– ڕۆژو –١٨– خولەك.
وەرزی زستان: سەرەتاکەی لە ٢١ کانونی یەکەمەوە دەست پێدەکات، کە ئەوسا خۆر لە کەلووی – جەدی– میوانە ئەو شەوە درێژ ترین شەوە. ماوەی وەرزی زستان –٨٩– ڕۆژو یەك کات ژمێر.
کاتی زستانە و کاتی هاوینە: شەوو ڕۆژ هەر –٢٤– خولەکە بەلاّم زەوی لەبەر گەورەیی دووڕۆژ هەلاّتو دوو ڕۆژ ئاوای هەیە، خەتی گرینویچ کراوە بەنیشان لەڕۆژ هەلاّتی گەر خۆر بێت دونیا ڕۆژ باشی گرینویچ شەوە، وەهەرکا تیشکی خۆر گەیشتە سەر خالّی دیاری کراو لای ئێمە شەو دەست پێدەکات وەلای ئەوان بەیانیە. کاتژمێرەکانی دونیا لەسەر ئەو نەریتە ڕێکخراوە، پاشان زاناکان بۆیان دەرکەوت کە خۆر درەنگ و زووی هەیە واتە لە زستان خۆر درەنگ هەڵدێ وەلە هاوینان زوو هەڵدێ، جالەبەر ئەوە هەستان بەدانانی کاتی هاوینەو زستانە.
یەکەم جار لە بەریتانیا لە سالّی ١٩١٦ دەستی پێکرد بۆ ئەوەی پاشەکەتی لەسووتەمەنی بکەن، لەسالّی ١٩٢٢ بووە ڕەسمی لەسالّی – ١٩٢٤ بەزۆری بەکار هات پاشان سەرەتای دونیای گرتەوە لەقورئاندا ئاماژە بۆ ئەم دیاردەی ڕۆژهەلاّتە کراوە(رب المشرقين ورب المغربين*الرحمان* ١٧).
بەرگە هەوای زەوی: زەوی سوپێرێکی هەوایی هەیە کە دەیپارێزێت لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە(وجعلنا السماء سقفا محفوضا * الانبياو ٣٢)کە ئەم بەرگە زۆر ئەستوورە، چینی یەکەمی لە نێوان ٧–١٢ کم ئەستورە ٧٥ لەغازات پێکدێت کەرێژەیان هەر لە گۆراندایە، لەدوای ئەو چینێکی تردێت

تابەرزی ٥٠ کم کە پلەی گەرمی ئەو بەرگە دەگاتە ٣٠ پلە وە ئۆزۆنی تێدایە کەزەوی دەپارێزێت ، پاش ئەویش بەرگەهەوایکی تریش دێت کەبە ئەیۆنات مەشحونە پاشان بەرگە هەواکە تەنك دەبێت و نامینیێ. لەسووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا بەبەرگە هەوا دەخشیێ هێزێکیکارەبایی دروست دەبیێ کەوا دەکات زەوی تەرازووی خۆی لەدەست نەدات. لەبەر ئەوەی زەوی کەوتۆتە نێوان باوەش گیری موغناتیسی مانگ و خۆر، هەر گۆڕانکاری لەم دووانە ڕوودات کار لەزەویی دەکات.

## گۆڕانکاریەکانی زەوی:

لەو ڕۆژەی کەزەوی دروست بووە هەردەم لە گۆڕاندابووە،ئەو ووشکانیەی زەوی ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر ئەم دیمەنەی ئیستای نەبوە. زاناکان پاش لێکۆلینەوە بۆ یان دەرکەوتووە کە ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر کیشوەری دایك هەبووە بانجیا کە هەموزەوی یەك کشوەر بووە پاشان بە چەندین ملیۆن ساڵ بۆ تە دوو کیشوەر(لۆراسیا ، لیمۆریا)ئەویتر(جواندوانا، غندوانا)، وەپاشان کیشودری (ئەتڵەنتید) دروست بووە پاشان شكلی زەوی گۆڕاوەکیشوەری نویێ دروست بووە. لەقورئاندائاماژە بەم کارە کراوە دەفەرموی:

(والسما و ذات الرجع والارض ذات الصدع * طلاق* ١٢) زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە زۆر کەندی گەورە هەن وەکو :

١- کەندی تونجا کەلەناو دەریایە لەشکڵی ٧ ئینگلیزی لەنێوان زیلەندی نویێ و دۆرگەی ساموا وتۆنجا ، درێژیەکەی ١٢٠٠ میلە.

٢- کەندی لۆسیان ماریان ، لرۆخانەی – یابان و فلیپین، پانی ٥ میلە

٣- کەندی گەورە کەدرێژی ٤٥ هەزار میلە لەنزیك ئالاسكاوە دەست پێدەكات تادەریای هیندی پاشان لەدەورەی كیشوەری ئەفریقیا دەسوڕێ بۆ دەریای ئەتڵەسی پاشان سەردەكەوێتەوە، زۆر بەی روداوی بۆ مەلەرزە لەسەر ئەم كەندەیە راپۆرتی زانایان لەسەر ئەوەیە كەچاخەكانی زەویان دابەشكردووە بەچەند بەش:

١- چاخی شارەوە: كریبۆنویزك كەنازاندرێ چۆن بووە بووە.

٢- چاخی كۆن كە لەلایەن زاناكان بەچاخی نشوء دەناسرێ كەلەم چاخەددا هەڵمی ئاو گەلێك زۆر بووە تیشكی سەر بنەوشەیی (فوق البنفیجی) گردیلاكانی بەیەك ستراندوە هایدرۆجین و ئۆكسجینیلە یەك دوور خستۆتەوە، هایدرۆجینەكە بەر بۆتەوە ئۆكسجینەكەشهاترتە بەرگە هەوای زەوی. هەر ئەو تیشكە كەنا هێلێ ئاوی سەر زەوی بفەوتێ و گردیلەكانی لەیەك بترازێ وەبە چاخەكەشدەڵێن- بالزویك.

٣- چاخی ناوەند- میزویك – لەو چاخەدازەوی قەراری گرتووە وەشینایەتی لەسەر پەیابووە ، وەكو داری زۆر گەورە (سەرخاس و سجلاریا) كەزاناكان لە شوێنە جۆربەجۆرەكانی دونیادەیدۆزنەوە وەكو – حەوزی جۆنگار لە چین- كەئەم دارانە لەشیوەی – متحجرات- ماوون مێژوویان دەگەرێتەوە – ١٢٠- ملیۆن ساڵ. هەر لەو سەردەمە گیان لەبەری ئاوی زۆر زەبەلاح پەیابووە (دیناسۆرات) دوای ئەوەش گیان لەبەری گۆشت خۆری زەبەلاح پەیابووە خودای مەزن ئامازەی پێكردوە (وجعلنا من الماء كل شيئ حي * الانبيا ٣٠) زاناكان چاخەكان دەكەن بەدووبەشی سەرەكی: كامبیری – و – بەر كامبیری كەبە هۆیانەوە چاخەكان و گۆرنكاریەكانی دروست بوونی زەوی ئاشكرا دەكەن

## پەیابوونی مرۆڤ لەسەر زەوی:

زاناکان لەو باوەڕەدان کەلەسەرەتا زەوی کە دروست بووە وەکو تۆپێکی ئاگر بووە پاشان بەچەندین ملیۆن ساڵ و چەندین گۆڕانکاری ئەمجار زەوی سارد بۆتەوەو ئەم شکلەی ئێستای وەر گرتووە، وەهیچ ژیانێك لەسەری نەبوە لەم ئایەتە زۆر بەباشی دەردەکەوێ کەخودای مەزن لە باسی دروست کردنی – جین و ئینس – دا دەفەرمووێ: (والجان خلقناه من قبل من نار السموم) واتە پێش ئینسان جنۆکەی لە








★ شكل رقم (١) انشطار القارة الأولى، ونشأة القارات وتطورها في العصور الجيولوجية المختلفة:
أ ـ الأرض الأم ـ القارة الأولى بانجيا ـ كما كانت عليه قبل ٢٠٠ مليون سنة تقريباً.
ب ـ الكرة الأرضية في نهاية العصر الترياسي قبل ١٨٠ مليون سنة، وبعد ٢٠ مليون سنة من بداية الانجراف. خلال هذه المرحلة نشأت القارتان الكبيرتان ـ لوراسيا وجندوانا.
جـ ـ الأرض في نهاية العصر الجوراسي بعد ٦٥ مليون سنة من بدء عملية الانجراف.
د ـ الأرض في نهاية العصر الطباشيري، أي قبل ٦٥ مليون سنة.
هـ ـ الأرض في العصر الحاضر.
و ـ هكذا ستبدو الأرض بعد ٥٠ مليون سنة، إذا ما استمرت حركة الصفائح الحالية ★

ئاگر دروست کردووه، پاشان ماوەیەکی زۆر دوور ئەمجارە مرۆڤی لەسەر زەوی دروست کردوە، بەلاّم نازاندریٚ کەی بووە. پەرتوکە ئاینیەکان بەتایبەت قورئانی پیرۆز باس لەوە دەکەن کەهەموو مرۆڤیٚك لەبابەگەو رە – ئادەم– کە خودا دروستی کردووە وەپاشکەوتوون، هەروها رونیشی کردۆتەوە بەپیٚی جوگرافیای زەمانی و مەکانی چاخەکانی گونجاندنی مرۆڤەکە وەکو دەفەرمویٚ: (وقد خلقکم اطوارا * نوح – ١٤–) ئەم ئایەتە مانایەکی تریش دەبەخشیٚ کە مرۆڤبە چەند هەنگاو دروست دەبیٚ هەر لەناو زگی دایکی تا پیر دەبیٚت و دەمریٚ. ئایا مرۆڤەکانی سەردەمانی کۆن وەکو ئیٚستا وابوون! هەر خودا خۆی ئەم نهیٚنیە لەچەند ئایەتیٚك ئاشکرادەکات کەتەمەنیان زۆر دریٚژ بووە لەشیان پتەو بووە کەلەشیان گەورە بووە لەباسی حەزرەتی نوح دەفەرمویٚ: (فلبث فیهم الف سنه الاخمسین عاما * عنکبوت–١٤–) وەپاشان لەچەند شویٚنی تر باس لەم مرۆڤانە دەکات وەکو لەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەردەکەویٚ:

(بل متعنا هولاء وابائهم حتی طال علیهم العمر * انبیاء –١٤)

(اذ جعلکم خلفاء من بعد قوم نوح و زادکم فی الخلق بسطه * اعرف – ٦٩)

(کانهم اعجاز نخل خاویه * الحاقه – ٧–)

ئینجا بابگەریٚنەوە لای تویٚژینەوەی زاناکان. پاش دانانی – بۆ چوونی دارۆن– کە مرۆڤ لەمیمونەوە بە هۆی تیٚپەرینی زەمانە وای لیٚهاتوە، زاناکانلەسەر تا سەری جیهان گەران بۆ دۆزینەوەی ئەم باسە، تالە ئەنجامدا مرۆڤی کۆنیان دۆزیەوە. لەسالّی ١٩٢٩ لەناوچەی تشۆ کۆتین – چین مرۆڤی پەکین لەژیٚر خاك دۆزراوە کە ٤٥٠ هەزار سالّ پیٚش ئیمرۆ ژیاوە، هەرلەچین لاشەی مرۆڤیٚکی دۆزاوە کە –١٥– پیٚ دریٚژ بو ، سینگی وەکو بەرمیل وابو

شەویلاکی زۆر بەهێزوو گەورەبوو پاشان هەمان جۆر مرۆڤ لە – ئەفریقیاو – جاوە – دۆزراوە زاناکان ناویان نە مرۆڤی – چیچا انترۆپرۆس– . دکتۆر لێل – لەتەنجانیقا– کەللەسەرێکی دۆزیەوە پاش پشکنینی دەرکەوت کە ئەم مرۆڤە پێش یەك ملیۆن ساڵ ژیاوە. لە – بەریتانیا و ئەڵمانیا مرۆڤی سوانسکۆب دۆزراوە کەبالآی ئەم مرۆڤەانە کورتەو کەلە سەریان ریان گەورەو شەویلاکیان گەورەیە ملیان کورتەو پێش ٦٠ هەزار ساڵ ژیاون . لەئەشکەوتی شانەدەر مرۆڤی نیاندەرتاڵ دۆزراوە کە بالآیان پێنج پێ و هەشت گرێ بوو کەلەسەر یان ١٦٠٠ بوو پێش ٥٠-٦٠ هەزار ساڵ ژیاون. زۆران مرۆڤی تر دۆزراونەوەکە بۆچوونی دارۆن ڕاست نییە چونکە ئەم مرۆڤانە جیاواز بوون لە پیکەری مەیموون – ئیسقانی حەوزی مرۆڤ لەهی مەیمون پانترە ئیسقان یسەر بەندەی زۆرترەکەوا لە مرۆڤ دەکات بەباشی رابوەستێ ملی مەیمون کورتە گرێ دەست و پێی درێژ ترە لەهی مرۆڤ بۆشایی جومجومەی بچوکترە لەهی مرۆڤ . ئەو مرۆڤانەی کەلاشەیان دۆزراوەتەوە دەرکەوتوەکە – کار بۆ هێدرات – لەناو ئیسقانەکانیان کەمە واتە کەم گۆشتیان خواردووە. ئەمەش جەدوەلی زەمانی مرۆڤەکە زاناکان دایان ناوە.

## چەند پرسیارێك بۆ لێكۆڵینەوە

پێشكەوتنی زانستی ئەستێرە ناسی لە جیهاندا و پەیدابوونی هەندێ دیاردەی سەیر لەبارەی فڕۆكەی قابلەمەیی(الصحن الطائر)درۆ یان ڕاست ، وای كردوە كە زاناكان لێكۆڵینەوە زانستی دەست پێبكەن كە ئایا مرۆڤی تر لە ئاسمانەكان هەیە ! ئایا هەریەك ئاسمان یان هەریەك زەوی هەیە یانا هەروەها نیزامی فەلەكی هەر وەك خۆی دەمینێ! ئایا كات لە ئاسمان وەكو كاتی زەوییە! بۆ ئەم مەبەستە ملیارەها پارە سەرف دەكرێت سەدان ساروخ بەرەو ئاسمان هەڵدەدرێ، بەڵام زاناكان زیاتر سەر سام دەبن لەو زانیاریانەی كە بەدەستی دێنن. لە قورئانی پیرۆز خودای مەزن ئامارەی بۆ زۆر نهێنی كردووە، لەباسی ئاسمانو زەوی كە ژمارەیان چەندە دەفەرمووێ: (الله الذی خلق سبع سماوات و من الارض مثلهن یتنزل الامر بینهن* طلاق- ١٢) مانای حەوت ئاسمان و حەوت زەویم دروست كردووە فەرمایشی منیان تێدا جێبەجێ دەكرێ. هەروەها نیشانەیەكی تریش ئاشكرادەكات كە بەڵێ وەكو زەوی ئێمە هەر حەوت زەمینێكە هەریەكەی ڕۆژ هەلات و ڕۆژ ئاوایان هەیە دەفەرموێ: (فلا اقسم برب المشارق والمغارب انا القادرون* المعارج ٤٠) هەروەها دەری دەخات كە گیان لەبەرو ئینسان لەوێ هەیەو وەكو دەفەرموێ: ( الحمد الله رب العالمین) یاخود دەفەرموێ:( الم ترا ان الله یسجد له من فی السماوات و من فی الارض *حج- ١٨) ووشەی - من بۆ گیانلەبەری ژێر بەكاردێت ، واتە ژیان لەو شوێننانەش هەیە، هەروەها دەفەرموێ: گەر دەتانەوێ بچنە ئەوێ دەبێت هێزێك و دەسەلاتان هەبێت (یامعشر الجن والانس ان استطحتم ان تنفذوا من اقطار السماوات والارض فانفذوا لاتنفذون الابسلطان* الرحمان- ٣٣) هەروەها بۆ دیاری كردنی كات ئاشكرای كردوە

کە کاتیٚ ئاسمانەکان وەکو کاتو سەعاتی زەوی نیە بەڵکو زۆر جیاوازە دەفەرمویٚ(وان یوما عند ربك کالف سنه مما تعدون* حج ٤٧) یادەفەرمویٚ: (یدبر الامر من السماء الی الارض ثم یعرج الیه فی یوم مقدارة الف سنه مما تعدون*سجده *٥) لێرەدا ئاشکرا دەبێت کە هەر ڕۆژێکی ئاسمان بەرامبەر هەزار ساڵی سەر زەوییە. زاناکانی سەر زەوی ئاماژەیان بەسەلماندنی ئەم باسە کردووە کەدەڵێن فلانە ئەستێرە ئەوەندە دوورە دەلێن تیشکەکەی وابەرێوەیە پاش سەدان هەزار ساڵ دەگاتە زەوی، ئەم باسە لە زۆر بەی کتێبە فەلەکیەکان باسکراوە.

زاناکان ئێستا کە شکەلأنێکیان دۆزیوەتەوە کە زۆر لەو کەشکەلأنە دەچێت کەزەمینی ئێمە تێیدا پێی دەوترێ – اند رۆمیدە– المره المسلسله– دووریەکەی – ٢٢٠٠٠٠٠ ساڵ روناکی دوورە. قورئانی پیرۆز

مجله الفیصل ع /١١٤ ص –٨٤–٨٥ /١٩٨٦

اسرار الکون – نسیب و هیبه – ص ١٨٠–١٩٢ جبابره وجدد

سومر مجلد– ٢٨ طهور الانسان دکتۆر عبدالجلیل ص –٣١–٥٣

# پاشکۆی باسەکان (ترسناکترین ڕووداو)

زاناکـان هـەردەم بـەردەوامن بەرامبـەر نهێنیـەکانی ئاسمـان، وەجـار بـەجار ئاگادارمـان دەکەنـەوە لـەڕووداوی ترسـناك لەسـەردەمە دوورەکـان و لـەوەپاش ڕوودەدات، باس لەوەدەکەن کەبەر بوونەوەی پارچە نیازێکی گەورە بەر زەوی کـەوتوون وە کۆتاییـان بـە ژیـانی دارو درەختەزەبەلاحـەکان و گیانلەبـەرە زەبەلاحەکان هێنا.

ئێستا پـەیتا پـەپیتا ئاگادارمـان دەکەنـەوە کەپیـسبوونی ژینگـە کارەسـات لەسـەر ڕووی زەوی دەخـولقێنێ، جالەبـەر ئـەوە داوا لەدەولـەتان دەەیـن کەکارگەگەورەکان کەمکەنەوە، وزەی پاك بەکاربهێنن ئەگینا پلەی گەرمی سەر زەوی زیـاد دەکـات بـاران کـەم دەبـارێ، دەبێتـە هـۆی سـەر هەلـدانی گرانـی و نەخۆشـی ترسـناك، وەتوانـەوەی بەسـتەلەکان وەزیـاد بـوونی کـاربۆن و پیـسبوونی ژینگـەو، پاشـان دادڕنـی چینی ئـۆزۆن هاتنـە ژوورەوەی تیـشکی سەرووی بنەوشەیی، سەر ئەنجام ڕوودانی کارەساتی گەورە.

خـودای گـەورە لـە دوو شـوێن ئاگادارمـان دەکاتـەوە کـە مـرۆڤ بەدەسـتی خـۆی خۆی تووشـی کارەسـات دەکـا، ئێـستا وایـە کـەوا خۆمـان ژینگـە ناپـارێزین وە دەفەرموێ:

(ظهر الفساد فی البر والبحر بما کسبت ایدی الناس لیوذیقهم بعض الذئ عملوالعلهم یرجعون * الروم ٤١) هەروەها لـەبارەی شـەق بـوونی چینـی ئـۆزۆن بـەهۆی پیـسبوونی ژینگـەو،ڕوودانی کارەساتی گـەورەو کۆتـایی ژیـانی سـەر زەوی دەفەرموێ:

(فـاذا انـشقت الـسماء فکانـت وردة کالـدهان * الرحمـان ٣٧) زاناکـان لـەو باوەڕەدان کەسـەردەمی کـۆن خڕۆکـەی زەوی گـەرمبووە، ئـاو لەسـەر ڕەوەکـەی

نــەبووە بــەڵکو هــەڵمی ئــاو لەئاسمانەکــەی زۆر بــووە، تیــشکی ســەرووی بنەوشەیی گردیلەکانی هەڵمەکەی لەیەکتر ترازاندووە کردوونی بە هایدرۆجین و ئۆکـسجین هایدرۆجینەکـە سـووکە چـونکە هـەوراز ، بـەڵام ئۆکـسجینەکە هاتۆتـە سەر زەوی و ئاسمانەکـەی، سـەرەنجام ژیـان لەسـەر زەوی پـەیابووە ئیستا بـەهۆی کونبـوونی چینـی ئـۆزۆن کەبەرەبـەرە لەبـەر پیـسبوونی ژینگـە زیـاد دەکـات دەبێتـە هـۆی هـاتنی چینـی ئـۆزۆن کەبەرەبـەرە لەبـەر پیـسبوونی ژینگـە زیـاد دەکـات دەبێتـە هـۆی هـاتنی هـەمان تیـشك لەرێـژەی زۆر بـۆ سـەر زەوی، ئەوسا وا دەکات بەخێرایەکی زۆر ئـاو لەسـەر زەوی ببیتـە هـەڵموباران نـەباری، دواجـار نـەمانی ژیـان هـەروەکو لـە سـورەتی الرحمـان خـودای مـەزن ئاماژەی پیکردووە.

گۆڤاری خاك – باپیرمان چۆن پێی گرتوە– ژ ٥٠– /٢٠٠١ ل ٤١–٤٣ ئاوات ع

## مانگ

لەسەردەمێکی زۆر کۆنەوە مانگ بۆتە جێگای سەرەنجی خەڵکی بەتایبەت شاعیرانی عاشق کە جەندین هەڵبەستی جۆراو جۆریان لەسەری ناوە. مانگ نزیك ترین ئەستێرەی گەڕۆکە لە زەوی کەقەبارەی نزیکەی چارەکی زەویە واتە تیرەکەی / ٢١٦٠/ میلە وە دووریشی نزیکەی ٢٤٠ هەزار میلە لە زەوی کە ئەم نزیکیە بۆ تە هۆی ئەوەی کە کاریگەریەکی زۆری بۆ سەر زەوی هەبێت بەتایبەت هەرچی شلەمەنی.

بۆنمونە کاتێك مانگ هەڵدێو بەرز دەبێتەوە ئاوی دەریاکەن – مەد– واتە زیاد دەکەن وە لەگەڵ ئاوابوونی سەر لە نویَ ئاوەکان نزم دەبنەوە. ئەگەر شەوێکی مانگە شەو لە زستانا باران بێت بارانەکە لەدوایدا دەبێتە بەفر بارین.

مانگ لەسەر خوین نشو نمای هەرچی گیانداره کاریکەرە، ئەو منداڵانەی یا خود گیانلەبەرانەی کەلەسەرەتایی مانگ هەڵاتن تاکو چواردەی مانگ لەدایك دەبن لەشیان پتەو تردەبێت لەوانەی پاش چواردە لەدایك دەبن، هەروەها گەر نەخۆشێك سەرەتای مانگ نەخۆش بکەویَ زووتر چاك دەبێتەوە لەوەی پاش چواردەی مانگ نەخۆش بکەویَ زووتر چاك دەبێتەوە لەوەی پاش چواردەی مانگ نەخۆش دەبێت. گەر یەکێك زیندەوەر پێوەی بدات لەسەرەتای مانگ ئەوا ژەهرەکەی کاریگەر تر دەبێت.

ئەمانەی هەموو لەلایەك، گەر مانگ بگیری و ئەو شوێنانەی کە مەشموولی گیرانەکەیە زۆر نزیکە بومەلەرزەی تێدا ڕوودەدات، چونکە لەگەڵ مانگ گیرانەکە شلەمەنیەکانی سەرزەوی و ژێر زەوی دەجولێن ئەمەش وادەکات کەتەختە پارچە زەویەکان جوڵەیان تێبکەوێت.

مانگ لەبەر نزیکیکەی بەزۆر شێوە بەرامبەر زەوی شێوەی دەگۆڕێ لە ئەر ئەوەی ڕووناکیەکەی بە زۆر شیوە بەرامبەر زەوی شێوەی دەگۆڕێ لە ئەر ئەوەی ڕووناکیەکەی لەخۆر وەیە خۆی ڕوناکی نیە.
لەیەکەم ڕۆژ شێوەی وەکو دەمەداسێکی باریك لای ڕۆژئاوادەر دەکەوێ، پاشان تا دەگاتە چواردە شەوێ هەر گەورە دەبێت دیسانەوە شێوەکەی ووردە ووردە بچووك دەبێتەوە. خودای گەورە ئەم نەریتەی واداناوە تاوەکو خەڵکی نەزان و خوێندەوار حیسابی مانگ و ڕۆژ بزانن وەکو لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ(یسالونك عن الآ هلة قل هی مواقیت للناس والحج * بقره ١٨٩)

## نێنیەکانی ڕووناکی مانگ

جاران خەڵك ویان دەزانی کەمانگ دەمووچاوی هەیە. بەڵام پاش ئەوەی زانست پێشکەت ئاشکرا بوو کە مانگ گەلێ بەرزیو نزمایی و چاڵی قوڵی دەشتایی هەیە. زاناکانی فەلەکی هەریەکەیان دۆزینەوەیەکی نهێنی مانگیان بە ناوی خۆیان کردووە بەرزترین زینجیرە شاخی سەرمانگ بەرزاییەکانی هیچنزە کە بەرزاییەکەی دەگاتە ١٩ هەزار پێ دووەم زنجیرە شاخ بەناو هاردلی باردلی کراوە کە بەرزیەکەی ١٥ هەزار پێیە لەسەر مانگ چالێکی زۆر قووڵی گەورە هەیە بەناوی مارۆلیکس گورگی ڕەش لەگەڵ چەند شوێنێکی تردا، هەروەها دەشتێکی پان و بەرین لەتەسکۆپ دیارە زاناکان ناویان ناوە بحر الامطار لەبەرئەوەی پارچە نیازکێکی زۆری بەسەردا دەباری کەوشوێنەکەیان دیارە.

حیسابی مانگی کۆچی (هیجری) لەسەر مانگ حیساب دەکریٚ وەکو چۆن حیسابی مانگە، بەلاٚم ژمارەی ڕۆژەکانی مانگیان جیاوازی هەیە، خودا مەزن ئامارژەی بەوەکردووە کەمانگ و خۆر حیسابی پیٚدەکریٚ(الشمس والقمر بحسبان* الرحمان)وەهەروەها دەفەرموویٚت کە لەو ڕۆژەو زەوی و ئاسمانی درووست کردوە سالٚ کردووە بە دوانزەمانگ

(ان عده الشهور عند الله اثنا عشره شهرا فی کتاب الله یوم خلق السماوات والارض * توبه* ٣٦).

خۆر دوانزەمالٚی هەیە پیٚی دەلٚیٚن- کەلو – برج بەلاٚم مانگ /٢٨/ مالٚی هەیە پیٚی دەلٚیٚن – منازل القمر- تاحسابە مانگ تەواو دەبیٚت هەر ڕۆژەی لەمالٚیٚك منزلە هەموو /٣٠/ ڕۆژ نیە بەپیٚی دیتنی مانگ دەگۆڕیٚ، زاناکان دەلٚیٚن دریٚژی ڕۆژەکانی /٢٩/ و /١٢/ خولەك و ٨ چرکەو دوو لەسەر سیٚ ی تروکەیەکەواتە هەندیٚ مانگی ٢٩ ڕۆژە هەندیٚ مانگ ٣٠ پرە خودای مەزن لەبەر زانینی ئەم حیساباتە مانگی بەو شیٚوەیە داناوە وەکو دەفەرمووێ(والقمر قدرناه منازل حتی عاد کالعرجون القدیم*یس*٣٩).

## ماڵەكانی مانگ (منازل القمر)

ئەستێرەكان ماڵەكە:

١- الشرطیان – دوو ئەستێرەكەی كەلووی شەك بەران-٢

٢-بطین- ئەستێرەی ناوكی كەلووی بەران

٣- حەوتەوانە- ثریا – كەلووی گا

٤- دوبران- ئەستێرە گەشەكەی كەلووی – گا-

٥-هقعە- ئەستێرەی ڕومەتی – جوزا.

٦-هنعە – ئەستێرە سەر كەوانی- جوزا.

٧-ذراع – ئەستێرەی سەرەوەی –جیوك توام.

٨-نثرة- ئەستێرەی ناوەندی كەلووی قرژاڵ.

٩-طرف- ئەستێرەی ملی كەلووی شێر.

١٠-جبهە – ئەستێرەیناو چەوانی كەلووی شێر.

١١-زبرە- ئەستێرەی دواوەی كەلووی شێر.

١٢-صرفە- ئەستێرەیسەر پشتی شێر.

١٣-عوا ء- ئەستێرەی بەیان.

١٤- سماك- ئەستێرەگەشەكەی كەلووی فەرێك

١٥-غفر- ئەستێرەی خواروی كەلوی فەریك

١٦- زەبانی- ئەستێرەی زەبانەی كەلووی فەریك

١٧-اكلیك – كۆمەڵی اكلیل

١٨-قلب – نیاط- ئەستیرە گەشەكەی كەلوی دووپشك

١٩- شووڵە- ئەستیرە گەشەكەی كەلوی دووپشك.

٢٠-نعائیم- ئەستێرەی كەلوی كەوان.

٢١-بلد- ئەستێرەی ناوەندی کەلووی کەوان.
٢٢-سعد الذبح- ئەستێرەی قۆچی کەلووی کارژاڵە.
٢٣-سعد البلع- ئەستێرەی سەردەستی کەلوی دەولك
٢٤-سعد السعود- ئەستێرەی شانی کەلووی دەولك
٢٥-سعد الاخبیە- ئەستێرەی شانی کەلووی دەولك.
٢٦-فرغ مقدم- ئەستێرەی کۆمەڵەی مایین الفرس
٢٧-فرخ مقدم - ئەستێرەی شەپڵکی کۆمەڵی مایین
٢٨-بطن الحوت- ئەستێرەی ناوەندی کەلووی حەوت.

ئەم ئەستێرەیانە لەیاسی کەلوەکان و کۆمەڵی ئەستێراندا بەباشی دەردەکەون جاران هەموو حیساباتێکی باران و گەرماو سەرما لەسەر ئەم ئەستێرانە دەکرا.

# نهێنیەکی گرنگی مانگ

لەپەرتووکە ئاینیەکان باس لەوەکراوە کەسەر زەمینی ئێستا هەر بەهار بووەو شەو نەبووە، بەلاّم لەدوایدا مرۆڤ دەستی بەگوناح و تاوان کردووە کردووە خودای مەزن نەریتەکەی گۆڕیوە کە مرۆڤ بە ئارەقەی ناوچەوانی نەبێت نانی پێدانەبێت . لەپەرتووکی (التورات ونظريه دارۆن-٤٥-) دەڵی مانگ وەکو خۆر رووناکی بەخش بووە، پاشان کوژاوەتەوە شەو پەیدابووە.

گەر لەقوورئاندا باسی ئەو ئایەتە بکەینەبینین خودا دوو نیشانەی داناوە یەکیان خۆرە نیشانەی ڕۆژە، ئەویتر مانگە نیشانەی شەوە، دەفەرمووێ نیشانەی ڕۆژمان هێشتەوە بۆ ئەوەی حیسابی مانگ و ڕۆژو ساڵ لبزانن(وجعلنل اليل وانهار ايتين فمحونااية الليل وجعلنا اية النهار مبصرة لتبتغو فضلا من ربكم ولتعلموا عدد السنين والحساب وكل شيى ء فصلناة تفصيلا* الاسرا ١٢ء).

(النجوم فی مسالكها احمد عبدالسلام – السيارات ص ١٩٧)

## دوورو نزیكی هەسارەكان لەسەر شێوازی هەرەمی كۆن

عطارت (٠+٤×٩٠٠٠)میل

زوهره (٣+٤×٩٠٠٠) میل

زەوی (٦+٤×٩٠٠٠) میل

مریخ (١٢+٤×٩٠٠٠) میل

مشتەری (١٢+٤×٩٠٠٠)میل

زوحەل(١٥+٤×٩٠٠٠) میل

ئۆرانۆس(١٨+٤×٩٠٠٠) میل

نبتۆن (٢١+٤×٩٠٠٠)میل

بلۆتۆ(٢٤+٤×٩٠٠٠) میل

## مانگ گیران و خۆر گیران

زەوی لەسەر چەقی جەمسەری باشووری بەشێوەی لەرینەوە خولدەدات بە شێوەی بازنەیی هەندێك دوور لە چەقەكەی لەبەر ئەوە مانگ هەردەم یەك رووی نیەو بچوكو گەورە دەبیٚ.

مانگ ئەگەر لەخولگی خۆی كەوتە ئاستی نێوان زەوی و خۆر ئەوا تیشكی خۆر بەقەدەر قەبارەی خۆی لە زەوی دەشارتەوە وە بەم دیاردەیە دەڵێن رۆژگیران. ئەگەر زەوی لە خولگەی خۆی كەوتە نێوان خۆرو مانگ بەقەدەر بەركەوتنی ئاستی ئەو شوێنە مانگ تاریك دەبێت ئەمەش پێی دەڵێن مانگ گیران .

(الفلك العام ت – عبدالحمید سماحه ص ٢٣ اسره الشمس)

## هەسارەكانی دیكەی خۆر

چۆن پەپولە لە دەوری چرایەك خول دەدات بەمشێوەیە ئەستێرە گەرۆكەكان لەدەرەوەی خۆر خول دەدەن، هەر هەمووشیان روناكی لە خۆرەوە وەردەگرن، واتە پرشنگدار نین، وەلە قەبارەدا لەیەك ناچن.

## ئەستێرە – عطارد**

ئەم ئەستێرەیە نزیکترین ئەستێرەی گەڕۆکە لەخۆر کەسەر جەم دووریەکەی دەگاتە ٥٧/٩ ملیۆن کم. بەخێرایی ٢٩/٥ میل لەیەك تروکەدا بەدەوری خۆیدا خولدەدات، هەرکەبەدەوری خۆردا خولدەدات بەخولگەیەکی – ئیقترانی – و نجمی خول دەدات جاری واهەیە کە ٤٣/٥میل دوورە جاری واهەیە ٢٨/٥ میل دوورە، واتە خولگەیەکی هێلکەیی هەیە، لەماوەی /٨٨/ ڕۆژجارێك بەدەری خۆر خول دەدات.

زۆر جار وا ڕێك دەکەوی ئەستێرەکە دەکەوێتە بەرامبەر زەوی وەکو لە شوباتی سالّی – ١٩٩٩ ڕوویدا وە لەسالّی ٢٠١٣ دووبارە دەبێتەوە، کە ئەم دیاردەیە ڕووی دا– عطارد– وەکو خالّێکی ڕەش لەسەر ڕووی خۆر دیارکەوت. نیوەتیرەکەی ٢٤٢٥ کم ڕەنگی گولّی و زەردە، پاش ڕۆژ ئاوا بەماوەکی کورت دەردەکەویّ(الفلك العام – السیارات ص ١٩٧–١٩٨ عبدالحمید سماحه)

## ئەستێرەی زوهرە- ڤینۆس

ئەم ئەستێرەیە لەبەر جوانی وگەشی سەردەم یۆنانیەکان پەرستراوە، پاش ڕۆژ پاش ڕۆژ ئاوا بوون دیارە. زاناکان بە جمکی زەوی لەقەڵەمی دەدەن چونکە قەبارەی بڕیك لە زی‌وی بچوکترە، نیوە تیرەکەی ٦٢٠٠ کم بەخێرایی ٢١/٥ میل ل یەك تروکەدا خول دەدات بەماوەی ٢٤٤/٧ ڕۆژێك خول تەواو دەکات بەدەوری خۆر بەلاری٣/٥ پلە، هەروەها بەدەوری خۆیدا لە ماوەی - ٤٧- ڕۆژ جارێك دەسووڕێ. دووریەکەی لە خۆر /١٠٨/ ملیۆن کم وە لەزەوی /٣٨/ ملیۆن کم دوورە، گەرمی سەر ڕووەکەی /٤٦٠/ پلەیە بەرگە هەوایەکەی ئاسمانی هەیدرۆجین و دیتریۆمی تێدایە هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕەنگەکەی جوان بووە. زووهرە دوو خولگەی هەیە لە خولگەی - ئیقترانی - بە /٢٢٥/ ڕۆژ یەك جار دەسوڕێ خولگەی- نجمی /٥٨٤/ڕۆژە لەماوەی خولیدانی بەدەوری خۆر /٢٣٥/ساڵ جارێك وارێك دەکەوێ. کەدەکەوێتە ئاستی نێوان زەوی و خۆر ئەوسا وەکو خاڵێك لەسەر خۆر دەردەکەوێ. زاناکان لە لێکۆلینەوە بەردەوامن چونکە هەندێك زاناوای بۆ دەچن کەوەکو زەوی ئاوەدان بووە پاشان مەداری خۆی گۆڕیوە ئەم کارەی بەسەردا هاتووە.

(اطلس المدرسی * مجلە العلوم ع -٣٣-١٩٨٩ کوکب الزهرە * الفلك العام ت- عبدالحمید سماحە)

## ئەستێرەی مەریخ

هەر لەکۆنەوە ئەم ئەستێرەیە ناسراوە، یۆنانیەکان بە ئەستێرەی شووم و شەڕ ناسیویانە کە گوایە دوو پاسەوانیشی هەیە بەناوی * فۆبۆس* و *دیمۆس. شاعیری میلی یۆنانی – لابۆتا چیرۆکەکی ئەفسانەیی دوورو درێژی بەناوی * گۆلڤەر* دامەزراندووە لەسەر مەریخ.

لەساڵی ١٨٧٧ ئەستێرە ناس ئاساف هۆڵ سەلماندی کە مەریخ دوو مانگی هەیە لە دەووری خولدەن یەکیان دوورەبە ٢١/٥ خولەك یەکجار ئەدەوریا دەسورێتەوە ئەویتر نزیکترە بە –١٠ خولەك یەکجار خولدەدات. ڕوسیاو نەمسا بلگاریاو ئەڵمانیا و فەرەنسا پرۆژەی – ڤێگا– یان–دانا کە نیازیان وایە بچنەسەر مەریخ و نهێنی هەردوو مانگەکەی ئاشکرابکەن و لە ئەنجامی لێکۆلینەوە دەرکەوت کە فۆبۆس قەبارەکەی

(٢٠ جاران×٣٠کم ) واتە ٦٠٠ کم چوار گۆشەیە وەناوی بۆشە ١٤/٦٠٠ میل دوورە لەمەریخ.

مەریخ لەزەوی بچووکترەنیوەتیرەکەی /٣٤٠٠/کم بە خیرایی /١٥/ میل لەیەك ترووکەدا خولدەدات، دووری لە خۆر /٢٢٨/ ملیۆن کم، وەبەیەك ساڵ و هەشتاو هەشت ڕۆژ جارێك بەدەوری خۆر دەسورێتەوە. شەو و ڕۆژ مەریخ /٢٤/ خولەك و /٤٠/ چرکەیە.

ڕووی مەریخ زۆر لە زەوی دەچێت ، وەگەلی دۆڵی قوڵ و شاخی هەیە زاناکان دەڵێن لەوانەیە لەهەردوو جەمسەرەکەی و ژێر زەویەکەی جۆرێك ئاو هەبێ ، لێکۆلینەوەی زاناکان بەردەموانەدووری لە زەوی ئێمە ٤٨/٥ ملیۆن میلە



کەڤاڵی زانست

هەسارەی سووری مەریخ و هێشووە
ئەستێرەی M44 لەئاسمانی
بێگەردی هەولێر

فۆتۆ: Azhy

2010/2/2 :542

## ئەستێرەی موشتەری

گەورەترین هەسارەی خۆرە نیوە تیرەکەی ٧١٣٥٠کم بە خێرای ١٠/١ میل لەیەك ترووکەدا بەدەوری خۆی دەسورێتەوە. ڕێژەی ناوەندی دووری خۆر /٧٧٨/ملیۆن کم، وە ٤٨٣ ملیۆن کم لە زەوی دوورە. لەفەلەکێکی بازنەیی بەدەوری خۆر لەماوەی
(١١ سالْ و ٨٨ ڕۆژ)یەك خولدەدا.

موشتەری نزیکەی /١١/ جار لەزەوی گەورەترە. ئەونهێنیانەی کە تا ئێستا لەسەر ڕووەکەی دەر کەوتوون ئەمانەن: بلقێکی زۆر گەورەی جولاْوی لەسەر ڕووەکەی هەیە سێ ئەوەندەی ڕووبەری زەویە، هەروەها ڕەشەبایەکی خۆلاْوی زۆر بەهێز لەسەر ڕووەکەی ڕوودەدا. لەساڵی / ١٦١٠/ لەلایەن – گالیۆ– ڕەچاکرا، پاشان ئاشکرا بووکە چوار مانگی هەیە (ئایۆ، یوربا، جانمید، کالیستۆ) لەساڵی ١٨٩٢ سێر برنارد مانگێکی تری دۆزیەوە، تا ساڵی ٢٠٠٢ توانرا سێزدە مانگ ئاشکرا بکەن. بێجکە لەم سیانزەمانگەو دوومانگەکەی مەریخ دەیان ئەستێرۆکەو ئەستێرەی کلك دار لە نێوان هەسارەی مەریخ و موشتەری دا هەیە. مانگەکانی تری موشتەری بریتین لە :

١- سایرۆس تیرەکەی /٤٨٠/ میل

٢- بالاس تیرەکەی/٣٠٦/ میل

٣- ڤێستا تیرەکەی /٢٤١ / میل

٤-جۆنۆ تیرەکەی /١٢١/ میل

٥- ئوستریا تیرەکەی /٥٠/ میل

٦- ئامور تیرەکەی /٢/ یکم

٧- كيلۆ پاترا/ ٢١٧/ كم ئەمەیان بەهۆی تەلەسکۆبی - بیندرا- پاشان بەشەپۆلی راداری پشکیندار دەرکەوت کەلە /٩٤/ جۆرە کانزا پێکهاتووە لە وێنەی ئیسقانی لووولاك دەچێ هەردووسەرەکەی ئەستوورە، زاناکانی ئاسمانی دەڵێن لە پێکەوە نووسانی دووبەردی گەورە دروست بووە (وێنەکەی لەلایەن زانا - سیڤی ئۆسترۆ وەکالەی - ناسا لەدووری /١٧١/ ملیۆن کم وەرگیروە).

٨- زانا ئایۆ - کالیستۆ بە کۆنترین مانگی موشتەری دەزانێ. لەسەر - ئایۆ گەورەترین گڕکان هەیە لەدووری ٣ ملیۆن کم لەموشتەری دۆرگەی ئاگر هەیە (جزیرە اللهب) کە گڕەی دەگاتە/٥٤٠/ ملیۆن پلەی فەرهانهایت (وکالە ناسا) مجلە الدوحە اکتوبر ١٩٧٩ ص ٨٣ حیاتنا المعاصرە خدیجە الصدر گۆڤاری خاك مایس ٢٠٠١ ل - ٣٥

الفك العام اسرە الشمس ص ٢٣ - هربرت سبنسر

الكون العمیق عبدالسلام الكردانی ص ٣٣٠- ٣٣٥-٣٣٤



وینه‌كه به‌ئامازه راداری‌یه‌كان

## زوحەل

جوان ترین هەسارەی خۆرە بەچەندین ئەڵقە دەراوە شێوەی شەبقەیە نیوەی تیرەکەی /٦٠٤٠٠/ ملیۆن لەزەوی /٧٧٤/ملیون کم، بەخێرایی ٦/ میل لەیەك ترووکەدا خول دەدات بەماوەی /٢٩/ ساڵ و /٤٦/ ڕۆژ یەك دەورە تەواو دەکات.

بۆیەکەم جار لە ساڵی -١٦٥٥ لەلایەن - گالیلۆ بینرا، لە ساڵی ١٧١٥ زانی کاسینی سێ پشتێنەی ئاشکرا کرد گوتی پشتێنەی یەکەم /١١/ هەزار میل ئەستورە بەڵام ئێستا زاناکان دەڵێن کە زوحەل زیاتر لەسەد پشتێنەی هەیە کە هەموویان لەغازات و پارچە بەرد پێك دێن وەبە شێوەیەکی زۆر ڕێك لەوەری دەسورێن.

تاکو ئیستا /١٥/ مانگ رەسەد کراوە، کەلەدەوری دەسورێن ئەمەش هەندێکیانە:

١- تیتان- لەهەموویان گەورەترە تیرە /٣٠٠٠/ میلە

٢- دایۆن- تیرەی /٣٢٠/ میلە.

٣- راهیا- ڕوەکەی وەك مانگە.

٤- تیپیز

٥- چاپینۆز

٦- میمارۆس

٧- هیبرۆن- درێژی /٣٠٠کم/ پانی ٢٤٠ کم، چاڵێکی قووڵی هەیە /١٠٠/ کم پانە

٨- ئەنکلا دۆس ٩- هۆپ ١٠- تیسێیس . مانگەکانی دیکە زانیاریان لەسەر نیە ئەو مانگانەی باسمان کرد لەلایەن زاناکان(بکرنج، کاسینی، ئنکلادس، ولیەم، هاریس،پۆند)ڕەچاو کراون.

## ئۆرانۆس

ئـەم هەسـارەیە بۆیەکـەم جـار لەلایـەن – ولیـەم هەرشـلْ– لەسـالّی ١٧١٠– دۆزراوە ماوەیەکی زۆری پێچو ئەمجارە زاناکان دیسان لێکۆلینەوەیان لەسـەر کرد.

ئەم هەسارەیە وەکو قوتویەکی قوپاو دەچێت لەسـەر لایەکی بەلاری /٩٨/ پلـە پالّکەوتووە، بەخێرایی – ٤/٢ پلە خولدەدات لەیەك تروکەدا بەدەوری خۆی.

بە ٨٢/٠٢– سالْ جارێك بەدەوری خۆر خولدەدات، شەووڕۆژ ١٠/٥– خولەکە، بە پێچەوانـەی هەسـارەکانی تـر دەخولێتـەوە واتـە لـە ڕۆژ هـەلأت بـۆ ڕۆژ ئـاوا.

نیوە تیرەکـە /٢٢٣٠٠/ کم، پێنج هەلّقەی بەدەور دا هەیـە لـە زوحـەل دەچـیْ.

دوورو نزیکی لە زەوی هەموو کات وەکو یەك نیە، پێنج مانگی هەیە.

(مجله العلوم –١٩٨٥– عدد ١٢ – حلقات ئۆرانۆس ص ٨)

()النجوم فی مسالکها – السیارات ص ١٩٧).

## نیبتۆن

لەسـالّی – ١٨٥٢ لەلایـەن زاناکـان دۆزراوە لـە سـالّی – ١٩٠٣ ڕەچـاو کـرا. دووریەکەی لە خۆر /٤٥٠٠/ ملیۆن کم واتە –٣٠– جار بەقەدەر دووری خـۆرو زەوی بـەخێرای – ٣/٩٢ میـل لەیـەك تروکـەدا خولـدەدات، شـەوو ڕۆژ /١٥/ خولەك و ٤٨ چرکەیە، بە ١٦٤/٧٩ سالْ یەك خول بەدەوری خۆردادەسووریْ.

نیوە تیرەکەی /٢٢٢٠٠/ کم ئەم هەسارەیە لەبەر سەیری خولانەوەکەی زاناکان هەرچـاوەدێری دەکـەن، ئـەم هەسـارەیە زۆر سـەیرە دەمێـك دەبریـسکێتەوە دەمێـك کـزە جـار واهەیـە سـەراو سـەر خولـدەدات جـاری واش هەیـە لەسـەر تەنیشتە، جاری واهەیە لە خولگەی خۆی دوور دەکەوتـەوە، لەبـەر ئەمـە تـەنها

چەند زانیاریەکی لەسەر هەیە، ئەویش ئەوەیە کە حەلەقەیەکی غازی لەدەوری هەیە، بەلاّم ئێستا دەرکەوتووە کە لە ئۆرانۆس گەورەترە.

(النجوم فی مسالکها ترجمە احمد عبدالسلام ص ١٩٧ السیارات)

(مجلە العلوم ع ١٢- ١٩٨٥ ص ٩ نبتۆن النجم لعملاق - میخایل عبدالاحد)

## پلۆتۆ

ئەم هەسارەیە زۆر کۆنەو لەلای - افریقیەکان- ناسراوەو پەرستویانە بۆ ئەوەی لە شەڕی خۆیان بپارزن . هەسارەکە وەکو تۆپەلی بەفرێکی گەورەوایە، دوری لە خۆر /٥٩١٠/ ملیۆن کم بە /٩-٢/ میل لەیەك تروکەدادەسووڕتەوە بەدەوری خۆیدا لە ماوەی شەش ڕۆژ و نۆ خولەك یەکجار، یەکەمجار لەلایەن زانا تۆمبۆ رەچاو کرا لە ساڵی ١٩٣٠ خولانەوەی زۆر ناڕێکە، یەك مانگی هەیە بەناوی - شارۆن.

## چۆن مەیلی زەوی زاندراوە کە ٢٣/٥ – پلەیە

لەو ڕۆژەی کە ئەستێرەناسی پەرەی سەندووە زاناکا هەوڵی ئەوەیانداوە کەشتی تازە بدۆزنەوە ئەوەی زاناکانی سەرسام کردبو ئەوەبو کە کاتێك خۆر هەڵدی بەرداریك دەکەوی لە شوێنیکی تەختایی سێبەر دروست دەکات وە ئەگەر بەدرێژای سێبەرەکە هیلێکی ڕاست بکێشین پاشان بەرەبەری خۆر ئاوادیسان سێبەری دارەکە بکەینە مەبەست و هێلکی تر بکێشین دەبینین هەردوو هیلی سیبەرەکان لە خالیك یەکتر دەبرن وزاویە دروست دەکەن ئەم جارە چەند زانا کۆ بوونەوە کە هۆیەکەی بزانن لەسەر دەمی خەلیفە مەئمون لە تەختای ناوچەی جزیرەداریکیان بەشاقولی چەقاند کە خۆر هەلآت سێبەری دارەکەیان نیشانکرد. ئەم جارگوریسیان هێنا بەدرێژایی سێبەر کە بۆ لایەکەی تر درێژیان کردەوە ئێستا هیلیك دروست بوو لە سێبەری دارە چەقاوەکە هەمان کاریان ئەنجام دا دەرکەوت کە هەردوو سێبەرەکە لە هەردووکاتدا ناکەونە سەریەك، پاشان لەهەموو وەرزەکان ئەم کارەیان ئەنجامدا دەرکەوت هیچ جیاوازی دەرناکەویٚ واتە هێلەکان بەسەر یەك تیناپەڕن بەڵکو یەکتر دەبڕن، هەروەها زاویەی هەردوولا پیورا– ٢٣/٥ پلە دەرچو بەوەدا زانرا کە زەوی بەلای خولدەدات بۆیە ئەم فەرقە دەردەکەوی(وینەکە باشتر ئەم کارە ڕووندەکاتەوە)

## کەلوەکان (الابراج)

خودای مەزن دەفەرمووێ: بسم الله الرحمان الرحيم (ولقد جعلنا فی السماء بروجا وزینا ها للناظرين* حجر -١٦)

یاخود دەفەرمووێ:(والسماء ذات البروج * واليوم الموعود* سوره البرج)

کەلو یەخود برج – چیە:

کەلو هەریەکەیان لەکۆمەڵە ئەستێرەیەك پێك دێن دابەشکراون بەدوازدە ناوچە کە هەریەکەیان ناوێکی تایبەتی هەیە، بەپێی وێنەکەی وینەی ئەم کەلوانە وەهمین تەنها بۆ ناسینەوەی شوێنەکە یانە.

ئەستێرەیەکی یەك جار زۆر لە ئاسمانەکان هەیە خودای مەزن چەند کۆمەڵیکی کردووە بە – کەلو– کەوەکو کۆشك کۆشك لەسەر یەکن لە شێوەی بازنەدا. ئەم کەلوانە هەموو حیساباتی زەمانە دەردەخەن هەر لە ترووکەیەوە تا ملیۆنەها ساڵ.

جـولاّنی زەوی: خولگـەی زەوی بـەدەوری خۆیـدا، خولگـەی زەوی بـەدەوری خـۆردا، خولگـەی کـەلوەکانیش هەیـە کەماوەکـەی /٢٥٨٠٠/ سـالّە بەواتـەی زاناکان.

هەرزەمانەو کەلوێك دەبێتە سەری بەهار واتە کەلوەکانیش جێگایان دەگۆڕن. لەسـەردەمی بابلیـەکان کـەلووی – گـا – سـەرەتای بـەهار بـووە بـەلاّم ئێـستا کەلوی شـەك (حمـل) سـەرەتای بەهارە. زاناکـان دەڵێن سـالّی /٢٢٠٠/ کـەلوی نەهەنگ دەبێتە سەرەتای بەهار، بەپێی خولگەی کـەلوەکان هـەر کەلوەبە /٧١/ سالّو /٢٤٣/ ڕۆژ و /١٦/ خولەك یـەك پلـە بە پاشادەدات چونکە هـەر کـەلوە بـە /٢١٥٠/ سـالّ جێگـای خـۆی دەگـۆڕێ وە خـودای مـەزن لـە قورئانـدا ئامـاەی پێکـردووە (والـسماء ذات الرجـع والارض ذات الـصدع * الطـلاق ١٢) باسـی زەویمان کرد کە کیشوەرەکان شکلیان گۆڕاوە، ئاسمانیش گەرانەوەی هەیەکە لەباسەکەدا دەردەکەوێ، وە ئەگەر ئەو گەڕانەوەیـە هەمووسـالّ سـەرەتای سـالّ کـەلووی – حمـل – شـەك نـەدەبو کـشو هـەوای زەویـش گـۆڕانی بەسـەر دانەدەهات. هەرکەلوەکان وایان بەسەر دانایەت بەڵکو لەگەلّ ئەو گۆڕانکاریـە شـوونی جەمـسەرەکانی زەوی بەرامبـەر ئەسـتێرەکان دەگـۆڕێ، بـۆ نمونـە زاناکـان دەلـێن: پـێش /٥/ هـەزار سـالّ ئەسـتێرەی کلکـی حـەزیا بەرامبـەر جەمـسەری بـاکووری زەوی بـوو، بـەلاّم ئێـستا ئەسـتێرە – جـەدی – بەرامبـەر جەمـسەری بـاکورە پـاش –٥– هـەزار سـالّی دیکـە یـەکێ لـە ئەسـتێرەکانی کۆمەڵی – قیقاوس – دەبێتە ئەستێرەی جمسەری باکوور، ئەم گۆڕانکاریانـە وا دەکـات کەمەرکـەزی موگنەتیـسی زەوی بگـۆڕی، واتـە ئـاوو هـەوای ناوچـەکەکانی زەویـش گـۆڕانی بەسـەر دادێ، بـۆ نموونـە هـەر لـە کوردسـتان بەپێ ڕاپۆرتی شوێنەواری دۆزراوەکانی – بەردە بەڵەکە – ناوچەی چەمچەمالّ

دەری دەخەن کە /١٠٠/ هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆ کوردستان ئاوو هەوای ئیستوای هەبووە. دۆزراوەکانی سەرەتاسەری جیهان ئەم راستیە دەسەلمێنن، چونکە ئێسقانی زەبەلاحیان لەشوێنە ساردەکان دۆزیوەتەوە کە ملیۆنەها ساڵ پێش ئیمڕۆ لەناوچەگەرمەکان ژیاون.

## کەلووەکان الابراج

### کەلووی شەك- کاوڕ- حمل

ئەم کەلوەلە /١٧/ ئەستئەم کەلوەلە /١٧/ ئەستێرە پێکدێت جواریان لەسەر پشتی وێنەکە سیانزەش لە ناوەوە. دوو ئەستێرەگەشەکە ناویان- شرطين - یەکیان لەویتر گەشترە، ئەستێرەی - حمل- لەسەر ناوچەوانییەتی، هەروەها ئەستێرەی - بطين- لاسەر دەندەی پشتیەتی.

ئەم کەلووە نیشانی سەرەتای بەهارە، ئەو وەختە خۆر لەسەر هێلی ئیستوا بەرەو باکوور هەلدەکشی پاش ئەوەی بە ٩ ڕۆژ هیلی ئیستوا دەبڕێ واتە لە /١٢/ مانگی - مارت- دەست پێدەکات لە ٢١ مانگ تەواو دەبێت.

### کەلووی - گا- الثور

ئەم کەلووە لە ٣٢ ئەستێرەی تاك و جوت پێك دێت ، جاران ئەم کەلووە سەرەتای بەهار بوو سەردەم بابلییەکان. ئەستێرەکانی بەم شیوەیەن:-

١- کۆمەڵی پێرو(ثریا) ئەم کۆمەڵە حەوت ئەستێرەی گەشی دیارە، بەلاّم لە راستیدا لە /١٠٠/ ئەستێرە زیاترە، پانی ئەو کۆمەڵە بە /٣٥/ ساڵی روناکی مەزندە دەکرێ بەلاّم لەبەر دووری و بچووك دیارە. هەورە ئەستیرەکی گەورە(سدیم) لە ناویا هەیە کەدووبەشە (تیتا- ب- سیگما- شەش) ئەم

هەوره وەكو چارۆگەیەكی سپی لە ناو تەلەسكۆب دیارە. پێرو لەگەڵ كۆمەلەكەیە بەلاّم، پاشماوەیەك بزر دەبێت هەتا سەرەتای هاوین دەرناكەوێ، وەهەر ئاوا ئابێت بە ئاسمانەوەیە تاسەرتای زستان كە ئاوابوو لەسەر كەل حەیوانە كیوی تیدەكەوی خەڵكی دەچن بۆ ڕاو.

٢- ئەستێرەی دووبران- گەش ترین ئەستیرەی كۆمەڵەكەیە زاناكان دەڵێن/٦٨/ ساڵی روناكی دووره تیرەكەی بەقەدەر /٤٥/ ئەوەندەی تیرەی خۆره.

٣- لەناو كەلوەكە چەندین كۆمەڵی ئەستێرەهەیە وەكو كۆمەڵی – قەلامس كە /١٣٠/ ساڵی روناكی دووره.

٤- هەوره ئەستێرەی – سەرەتان- لەناو ئەم كۆمەڵە چەندین ئەستێرەی – نیترۆنی هەیە /٧٠٠٠/ ساڵی رووناكی دووره. (الكون العمیق- د.علی الامیر ص ٢٢٧-٢٢٨)

## كەلووی جیوك- التوئمین- جیمنی

ئەم كۆمەڵە لەوێنەی دوو منداڵ دەچێ كە باوەشیان بەیەك كردووە، ژمارەی ئەستێرەكانی /٢٦/ دانەیە. ئەستێرەكانی كۆمەڵەكە زۆر بەیان دوو یان چوار چوار بەیەكەون. هەسارەی – ئۆرانۆس لەساڵی -١٧٨١ كاتێك بەنزیك ئەم كۆمەڵەدا تێپەری دەكرد رەسەد كرا هەروەها هەسارەی – پلۆتۆ- لەساڵی /١٩٣٠/ هەر لە نزیك ئەم كۆمەڵە ڕەسەد كرا. گرنگترین ئەستێرەی كۆمەڵەكە ئەمانەن:-

١- جۆتە ئەستێرەی / كەبەعەرەبی پەیَ دەڵێن (هقعە) بەیۆنانی – كاستۆر ئەم جووتە ئەستێرەیە لەسەر دەم و چاویەتی، كەدووانەن لەدەوری یەكخولدەدەن بەماوەی /٣٠٦/ ساڵ جارێك لە دوورەوە وەكو یەك ئەستێرە دیارن/٤٣/ ساڵی روناكی دوورن/١١/ جار لە خۆر گەورەترن.







Fig. 22.
(a & b)
facing p. [illegible]

## TAURUS




Fig. 23.
a & b

Facing p. 155

GEMINI







Fig. 24.
(a & b)
Facing p. 167

٢- جۆتە ئەستێرەی هنعە- کە ئەمانەش چووتن لە ئەستێرە گەورەکان حیساب دەکرێن کە پێیان دەڵێن سووره زەبەلاحەکان(المارد الحمراء)، هەروەها پروشك هاوێژن لە جۆری ko کە /٣٥/ ساڵی روناکی دوورن.

٣- جووتەی - و - ٦ ئەمانەش لەسووره زەبەلاحەکانن بەلاّم لەبەر دووری کز دیارن،

٤- جووتە ئەستێرەکانی سەر لاقی پییاندەڵێن - بەخاتی- خڕخاڵ.

## کەلووی قرژاڵ

ئەستێرەکانی ئەم کەلووە لەبەر دووریان کز دیارن - ٩- دانەیان کەوتونەتە ناو وێنەکە چواریان لەدەرەوەی وێنەکەن. ئەستێرەیەك لەناوی هەیە پێی دەلێن- نثرە- کە دوانی لەدەرەوەن پێیان دەڵێن - حمارین- واتە ئاخورو دووکەر، لەدەرەوەی ئەوانە هەورێکی ئەستێرەی هەیە (السدیم النجمی) کۆمەڵە ئەستێرەك هەیە پیی دەڵێن -m٤٤ - کەوەکو پوورەی هەنگ وایە.

حیساباتی مانگی هاوین لەم کەلووە دەستپێدەکات کە خۆر دەگاتە سەری ئەم کەلووە واتە /٢٢/ حوزیران، درێژ ترین ڕۆژ دەبێت و هاوین دەست پێدەکات وەخۆر چیدی هەوراز ناڕوا لەو کەلووە ئەم جارە ووردە ووردە خۆر دێتە خوار دیسانەوە بەهامان شێوەی سەرەکەوتنی تادەگاتەوە- زستان.

## کەلووی شێر

ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵە /٢٧/ دانەیە کە زۆر بەیان گەش و جوانن. دووری کۆمەڵەکە /٥٦/ ساڵی روناکیە وەهەندێ لە ئەستێرەکان دوورترن.

١- قلب/ دڵی شێرەکە لە هەموویان گەورەترە.

٢- زبرە/ جاران کاروانەکان لەبیابان کردوویانە بەنیشانە تاریگایان لێ وون نەبێت، دوو ئەستێرەی بچووکی لەتە نیشتە پیی دەلیین- خرزتان.

الترفە/ کەوتۆتە سەر دەموچاوی وێنەکە، دووئەستێرەی تەنیشتی پروشک هاوێژن بۆلای دڵی شێرەکە جاران بە تووڕەی شێرەکەیان لەقەڵەم دەدا، زاناکان دەڵێن لەیەك چرکەدا- ٧٠- پروشك دەهاوین.

لەساڵی ١٥١٠ ئەستێرەیەك لەم کەلووە زۆر بە شەوق کەوت بە نوێژی نیوەرۆ دیار بووە پاشان بزر بووە، زاناکان دەڵێن تەقیوەتەوە لە ناو چووە.







Fig. 26.
(a & b)
facing p. 182

CANCER







Fig. 25.
(a & b)
facing p. 173

## كەلووی فەریك – العذرا ء

ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵەیە وەکو شکلی – ل– دەچێت، ژمارەی ئەستێرەکانی نزیکەی /٢٦/ دانەیە هەموویان ووردن تەنهایەکی زۆر گەشی تێدایە کە پێی دەڵێن (سماك الاعزل) واتە ڕاوچی بی چەك /٢٢/ ساڵ رووناکی دوورە. نیوان ئەو کۆمەڵەو کۆمەڵی– وورچی گەورە ئەستێرەیە هەیە زاناکان ناویان ناوە شاریشاران (مجرە المجرات) تیرەکەی /١٠٠/ ملیۆن ساڵی ڕووناکی یە هەندێ لە زاناکان کۆمەڵی فەریك بەناوەندی هەموو فەلك دادەنین.

(الكون العميق د. علی الامیر مجاميع الصيف ص ٢٣٩)

## كەلووی تەرازو

ئەم کۆمەڵە لە /١٥/ ئەستێرە پێك دێت کە حەوتیان لەدەرەوەیە هەشتیان لەناو کۆمەڵەکەن ئەستێرەکانی – تەرازو – زۆر گەش نیە بەهۆی کۆمەڵی . دووپشك دەدۆزرێتەوە. ئەم کۆمەڵە کۆمەڵی پاییزن، لە /٢٢/ مانگی ئەیلول خۆر لەگەرانەوەیدا لەم ئەستێرانە میوانە ئەوسا کۆمەڵەکە بەگشتی لە ئاستی هێڵی ئیستوا دەبێت هەندێ لە ئەستێرەکانی ناویان لێنان، ئەو دووانەی کەکەوتوونەسەر قاپی تەرازووەکە پییان دەڵێن (زەبانی)، هەروەها ئەو سێ ئەستێرەی کەلەیەك ریزن پییان دەڵین(ئەکلیل). شاعیر دەڵی:–

لەناو کوردان تەرازوو          لەناو عەرەبان میزان
شەو ڕۆژ بەرامبەر دەبن          لەبەهارو پاییزان
ئاوی گۆزە خۆش دەبێ          بیخۆنەوە ئازیزان

## کەلووی دووپشك

ئەم کەلووە کۆمەڵی پاییزە لە /٢١/ ئەستێرە پێك دێت لەتەلەسکۆب وەکو ملوانکەی گەوهەر دیارن، هەریەکەی ناوی خۆی هەیە :-

١- نیاط - قلب العقرب

ئەم ئەستێرە قەبارەی زۆر زەبەلاحە بەڵام چڕی تەنەکەی کەمە زۆر پتەو نییە لە دوورەوە وەکو پشکۆی ئاگر دیارە بە تەنی - کاربۆن دەورە دراوە زاناکان دەڵێن گەرمی سەر ڕووەکەی /٩٠٠٠/ پلەی سانتی گرادە تیرەکەی /٥٦٣/ ملیۆن کم دەبێت /٤٠٠/ جار لە خۆر گەورەترە. ئەم ئەستێرە دۆستێکی هەیە لە خۆی بچووکترە، ڕەنگی کەسکی زمرودیە لەدەوری خول دەدات/٤٠٠/ ساڵی ڕوناکی دوورن. لەنزیك ئەستێرەکە چەند کۆمەڵی ئەستێرەی هیشوویی هەیە کە هەر یەکەیان لەدەیان ئەستێرە پێك دێن، وەکو کۆمەڵی (m٧/m٦/m٥/m٤) کۆمەڵی حەوت لە ٨٠ ئەستێرە پێك هاتووە.

٢- ئەستێرەی - شووڵە - لە وێنەکە لەسەر کلکی دووپشکەکەیە دەرکەوتنی ئەمانە نیشانەی هەنجیر پێگەیشتنە، هەروەها مەنزلەی مانگن.

(الكون العميق- مجاميح الخريف ص ٢٥٨- ٢٥٩)

VIRGO




Fig. 27.
a & b.
facing p. 194

## SCORPIUS




Fig. 29.
a & b
facing p. 210

## کەلووی کەوان

ژمارەی ئەستێرەکانی ئەم کەلووە /٣١/ دانەیە کەڕووبەرەکی زۆری داگیر کردووە لە مرۆڤیکی ئەفسانەیی دەچێت، کۆمەڵەکە بەناوەندی ڕێگای کاکێشان دەژمێرێن لەناو ئەو کەلوە ئەستێرەی – ئۆمیگا هەیە کە دە هەزار ساڵی ڕوناکی دوورە، هەروەها هەورە ئەستێرەی هۆر (سدیم الهور) لەو کۆمەڵەیە. بێجگە لەمانە چەندین کۆمەڵە ئەستێرەی هێشووی هەیە وەکو (m١٧/m١٨/m١٣) کەهەر اەدەیان ئەستێرە پێك دێت.

(الكون العميق ص ٢٥١ مجله الفيصل عدد ١١٤ حزيران ١٩٨٥ السدائم)

## کەلووی کارژەڵە – جدی

ئەم کۆمەڵە /٢٨/ ئەستێرەیە میوانی خۆر لەم کەلووە سەرەتای زستان و کورترین ڕۆژەواتە /٢١/ کانونی یەکەم هەموو ساڵنامە کوردیەکان لەم کەلوە ساڵنامەکەیان داناوە وەکو ساڵنامەی – گەڕاوی– لە ئاسمان لە شێوەی وورگێکی زەبەلاح دەچێت ئەستێرەکان زۆر کز دیارن لەبەر دووریان بۆ نمونە ئەستێرەی – ذنب– ٤٦٥ ساڵی ڕوناکی دوورە جاران وازانرابوکە– ٥٠ ساڵی روناکی دوورە. لەسەر قۆچەکانی دوو ئەستێرەی تر هەن کەبرێك لەوانی تر گەشترن پییان دەڵین – سعد– الذابح– کەمەنزیلەی مانگن.ئەفسانەی کۆن وایان لەقەلاّم داوە کە مرۆڤ لەو کەلووە هاتۆتە سەر دونیا وەدەگەرێتەوە ئەویٚ.

## کەلووی دەولك

ئەستێرەکانی ئەم کەلووە ڕووبەرێکی زۆریان هەیە، لەوێنەی کەسێکدان کە بۆریەکی ئاوی بەدەستەوە دەبێت، ژمارەی ئەستێرەکان/٤٢/ دانەیە کە زۆر بەیان ناویان هەیە چونکە حیساب گری قدیمەکان حیسابی کش و هەوایان پیداناوە ئینجا نازانرێت کەراستە یان ناوی ئەستیچرەکان بەم شێوەیەیە:-

١- سعد البلح/ سێ دانە ئەستێرەی سەر دەستین

٢- سعد السعود ئەستێرەکە لەسەر شانییەتی.

٣- سعد الملك/ ئەستێرەی سەر شانی ڕاست

٤- سعد الاخبیە/ دوو ئەستێرەی قورگی بۆریەکە دەرکەوتنی ئەم دو ئەستێرەیە گیان لەبەری خوێن سارد جوڵەی تیداکەوی.

## کەلووی نەهەنگ - حوت

ئەم کەلووە /٣٤/ ئەستێرەی کز پێك هاتووە لە شکلیدووماسی گەورە. زۆر بەی خۆر گیران و مانگ گیران لەکاتی دەرکەوتنی ئەم کەلووە ڕوویداوە، هەر لەبەر ئەوەیە کە هەریەکەیان کە گیراوە گوتویانە نەهەنگ قوتی داوە.

هاتنی ئەم کەلووە بەرامبەر مانگی ڕەشەمەی کوردیە. گەر لەم کەلوەدا باران ببارێت ساڵی خۆش دەبێت. پێشینان ووتوویانە مندالیك لەم کەلووە ببێت منالیچکی توندو تۆڵ دەبێت.

قسەو باسی زاناکانلەسەر ئەوەیە کەساڵی /٢٢٠٠/ کەلووی نەهەنگ دەبێتە سەری بەهار، ئیستا ئەم کەلوە دوایین کەلوە لەریزدا.

(الکون العمیق ص ٢١٦ - ٢١٧ مجامیع الشتاء)

AQUARIUS







Fig. 32.

## کۆمەڵی ئەستێرەگەورەکانی باکوور

پاشی ئەوەی کۆمەڵی ئەستێرەکانی کەلوەکانمان باس کرد، کۆمەڵەکە کەوتیتە ناوەند هەردوو کۆمەڵی باکوورو باشوور. کۆمەڵی ئەستێرەکانی باکوور بریتین لەمانە کەوتۆتە نیوەی بازنەی باکوور.

وهذه صورة الدب الاصغر على ما ترى في السماء




Fig. 1.

# کۆمەڵی وورچی گچکە

ئەم کۆمەڵە کەو تۆتە بەرامبەر جمسەری باکووری زەمین، لە حەوت ئەستێرە پێکهاتوون کە پییان دەڵین- بنات نعش الصغیر – لە شێوەی مەقلیدان. ئەستێرەکانی بەم شێوەیە ناسراوون:-

١- الفرقدان- واتە دوو ئەستێرەی سەر شەپیلکی وێنەکە، کە یەکیان لە یەکیان گەورە ترە.

٢- ئەستێرەی -جدی- یاخود ئەستێرەی جەمسەر، ئەستێرەکە زۆر ناوی هەیە، پۆلاریس- وڵف- خۆشاب – ئەستێرەی قیبلە، چونکە قیبلەی پێ دەزاندری. ئەم ئەستێرەیە لەراستیدا دووان لەدەوری یەکتر خولدەدەن یەکیان لەویتر گەورەترە بەلأم لەبەر دووری وا دیارن کەیەك ئەستێرەیە، دووریان بە /٦٨٠/ ساڵی ڕوناکی مەزندە دەکرێ، گەورەکە تیشکەکەی لە جۆری f8 واتە لە گۆڕاندایە، هەروەها لەگەورە زەبەلاحەکانە (المارد الحمراء).

(الفلك العام عبدالحميد سماحەخ ٢٠٠)

# کۆمەڵی وورچی گەورە

ئەم کۆمەڵە لە /٢٧/دانە پێکدێت، کەحەوتیان لەهەمان گەورەترو پرشنگدارن وە لە شێوەی – مەقلێدان– وە پییان دەڵێن – بنات النعش– گوایە کابرایەك تەنها حەوت کچی هەبووە بە تەنیا ژیاوون، کەبابەکە مردووە مەیتی بابیان هەڵگرتووە بۆ سەر قەبران.

ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵە هەردەم لەدەوری ئەستێرەکانی وورچی گچکەدەسوورین. ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەم شیوەیەن:–

١– قائید/ یەکەم ئەستێرەی کلکی وورچەکەیە/ ٢١٠/ ساڵی رووناکی دوورە.

٢– عەناق– یاخود میئزەر یاخود– سیاکۆش– ئەستێرەیەکی گچکە لە نزیکی هەیە بەناوی – سوها– جاران خەڵکی خۆیان تاقی دەکردەوە بزانن کێدەتوانی بیبینی.

٣– جوون یاخود – لیوث– ئەمە /٦٨/ ساڵی روناکی دوورە.

٤– دوو هەورە ئەستێرەی زەبەلاح لە ناو کۆمەڵەکە هەیە یەکیان لای سەری وورچەکەیە پیدەڵینە هەورە ئەستێرەی (البوم) سدیم البوم گوندە بوو کە دوو ئەستێرەی چاووی ورچەکەیە لەناویدایە، هەورەکە بە m٩٧ ناسراوە. لەسەر پاشەڵی وورجەکەش هەورە ئەستیرەی m٨١ هەیە. زاناکان دەڵێن ئەم هەورانە پاشماوەی ئەستێرەی گەورەن تەقیونەوە و لە ناو چوون.

## کۆمەڵی تەنین- حەزیا

ئەم کۆمەڵە وەکو حەزیایەکی درێژو گەورە دەورەی ئەستێرەکانی وورچی گچکەیان گرتووە جاران گوتراوە کە پاسەوانی لە ئەستێرەی - جدی- قوتب دەکات. ژمارەی ئەستێرەکانی /٣١/ دانەیە. وە ئەو پیت و ناوانەی کەلەوێنەکە دیارە لەبەر زانینی دەرەجەو، دووری، شوێنی لەسەر ئالەتی ئسترلابە- چونکە جاران ئەم ئالەتە لە هەموو مەدرەسە ئاینیەکان دەخوێنرا.

Plate No. 14

**Ulugh Beg Royal Library Codex**

[Bib. Nat. Paris 5036]

A Specimen of the illustrations of Constellations out of which the blocks were made for this edition.




**Folio 23 ᵃ - Ursa Minor**

(cf. printed illustrations Fig. I a & b)

**DRACO**

صور الكواكب لابي الحسين الصوفي

صورة التنين على ما ترى في السماء




**Fig. 3.**
**(b)**
**between pp. 41 & 41**

## کۆمەڵی قیقاوس

ئەم کۆمەڵە لەسەر نەخشەی فەلەکی وەکو زەرف و کاغەزی کراوە دەچێت لەو کۆمەڵانەی کەدەورەی بازنەی فەلەکی باکووریان گرتووەو ژمارەی ئەستێرەکانی /١٣/ دانەیە. ئەستێرەی (د)کەلەسەر شانیەتی زاناکانی سەرسام کردووە چونکە جاری وا هەیە زۆر کزە جاری وا هەیە گەشە ئەم حاڵەتە پێنج رۆژ و هەشت خولەك دەخاینیت. زاناکان دەڵێن پاش/٥/ هەزار ساڵی دی یەکی لەو ئەستێرانە دەبیتە ئەستێرەی جەمسەر لەجیانی ئەستێرەی – جەدی– (الكون العميق ص ٢٣٤ د. علی الامیر)

## کۆمەڵی العواء – بووق لیدەر

ئەم کۆمەڵە/٢٣/ ئەستێرە پیك هاتووە زۆر ناوی لێندراوە وەکو (عەناز – صناج حارس الشمال– ارکتۆرس– کاروانکوژە). کۆمەڵەکە لەسەر نەخشەی فەلەکی وەکو کۆلارەی مندالآن دەچێت.

ئەستێرەی – السماك الرامح– کەوەکو ئەڵماسی زەردە پێش بەیان دەردەکەوێ تیشکەکەی ئەوەندە بەهێزە لە – جامیعەی هار فۆرد– تیشکەکەیان گواستەوە سەر زەوی‌بەهۆی ئامێرێك، کە جەرەسێکی بچووکیان پێ بەگەر خست.

ئەستێرەکە /٤٠/ ساڵی رووناکی دوورە /٢٤/ جار لە خۆر گەورەترە، گەرمی سەر ڕوەکەی بە /١٥/ هەزار پلەی سانتیگراد مەزندە دەکرێ. زۆر چیرۆکی سەیر لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەیە کە لە کوردەواری ناویان ناوە – کاروان کوژە– ئەستێرەی دووەمی کۆمەڵەکە لەسەر قوڵی وێنەکەیە پیی دەڵێن

(ابسلۆن٥) ئەویش لەسووره زەبەلاحەکانە. لەنێوان کۆمەڵی وورچی گەوره ئەم کۆمەڵە هەوره ئەستێرەیەکی گەوره هەیە بەناوی (سدیم m٥).

کۆمەڵی اکلیل یاخود فەکە کەوەکو پیتی (u) دەچێ لەنزیك کۆمەڵی عەوایە، کە ژمارەی ئەستێرەکانی، هەشت دانەیە، کە هەموویان کزن.

## CEPHEUS

صور الكواكب — لابي الحسين الصوفي

صورة قيقاوس على ما ترى في السماء




**Fig. 4.**
**(b)**
**between pages 47 & 48**

## BOOTES




**Fig. 5.**

**(b)**

**between pages 94 & 95**

## کۆمەڵی هەرقەل- الجاثی

ئەم کۆمەڵە لە /٢٨/ئەستێرەیە پێکدیت کە زۆر بەیان جۆتەن یاخودتۆ پە لتۆپەل بەیەکەوەن، لەوانە کۆمەڵی خرەکان(المجامیح الکرویە) لەجۆری m١٩ ئەستێرەی سەرەکی کۆمەڵەکە کە پیی دەڵێن – کلب الراعی- سەگی شوانان زاناکان دەڵێن لە سووره زەبەلاحەکانە تیرەی /٤٥/ بلیۆن کم /٣٠/ هەزار جار لە خۆر گەورەترە کە ئەستێرەیەکی لەدەورە دەسوری کەلە شەمولە سپییەکانە (الاقزام البیض) واتە چڕی تەنەکەی وتیشکەکەی زۆر بەهێزە.

## کۆمەڵی شلیاق

ئەم کۆمەڵە لەئەستێرەکانی هاوین دەژمێری، ژمارەی ئەستڕەکانی /٨/ دانەیە یەکی لە ئەستێرەکانی زۆر گەورەیە لەسووره زەبەلاحەکانە /٢٦/ساڵی ڕوناکی دووره، پیی دەلێن- ڤیگا- کاتی ئاسمان وەك هی زەوی نیە زاناکان دەڵێن پاش /٣٠٠/ هەزار ساڵ ئەمجار لەخۆر نزیکدەبێتەوە.

ئەستێرەی دووەم لەگەورەیی لەسەر ڕانی وێنە کەیە ڕەنگی پرتوقاڵیو زەردە.

زاناکان دەڵێن هەوره ئەستێرەکی ئەلقەیی لە ناویا هەیە کەلیکۆلینەوە لەسەری بەردەوامە.(الکون العمیق مجامیع الصیف ص ٢٤٢-٢٤٣)

## کۆمەڵی مریشك – الدجاجە

ئەم کۆمەڵە لە ئەستێرەکانی هاوینە ، ژمارەی ئەستێرەکان /١٧/ دانەیە وەبەم شێوەیە ناسراون.

١- ذنب/ کلك ئەستێرەیەکی زەبەلاحە لەخۆر گەڵێ پرشنگدار ترە لەجۆری A٢ لەبەر دووری کە /١٦٠٠/ ساڵی روناکیە زانیاری تەواوی لەسەر نییە.

٢- بیریە- ڕەنگی کەسك و زەردە لەبەر دووری زانیاری لەسەر نیە .

٣- نەورەس- کە دوو ئەستێرەن لەسەر باڵی، یەکیان بەرێگای پیوانەی لە ڕێنەوەدەرکەوت کەلە جۆری B٦١ بەخیرایی /٨٠٠/ کم لەیەك تروکەدا بەدەوری خۆی خولدەدات، هەروەها /١١/ ساڵی ڕوناکی دوورە. ئەستێرەی دووەمی لای ڕاست لە جۆری - ۆ- بەرەنگی زەرد و پرتوقاڵیە /٧٤/ ساڵی ڕوناکی دوورە. لەناو کۆمەڵی - دجاجە- هەورە ئەستێرەکی تاریك هەیە زاناکان ناویان ناوە (کیس الفحم- فەردەی ڕەژوو)، شەپۆلێکی دەنگی لەم شوینە رەچاو کرا زاناکان وایانزانی کەدەنگەکە هی دەنیایاکی دیکەیە، بەلاّم دەرکەوت کەدوو ئەستێرەی ناو هەورەکە لەیەك نزیك بوونەتەوە شەپۆلی X١ فرێدەدەن.

HERCULES




**Fig. 7.**

**(b)**

between pages 83 & 84

## LYRA




**Fig. 8.**
**(a & b)**
**facing p. 68**

**CYGNUS**

صور الكواكب لابي الحسين الصوفي

صورة الدجاجة على ما ترى في السماء




**Fig. 9.**

**(b)**

**between pages 73 & 74**

## کۆمەڵی کسیوپیا- ذات الكورسی

شێوەی کۆمەڵەکە وەکو ژنێکە لەسەر کورسی دانیشتبێت، زۆربەی ئەستێرەکانی بەشەوقن ژمارەیان/١٣/ دانەیە ئەوەی ناسراون ئەمانەن:

١- الكف الخضیب / دەستی خەناوی رەنگی سوورو زەرد لەسەر مەچەکیەتی.

٢- کسیوپی/ ئەستێرە گەشەکەی سەر کورسیەکە، ئەمە دوو ئەستێرەیە لەدەورەی یەکتر خولدەدەن لەماوەی /٥٥/ ساڵدا زۆر گەورەن لەسەروی سوورە زەبەلاحەکانە/١٥٠/ ساڵی ڕوناکی دوورە.

٣- ئەستێرەی مەرکب/ لەسەر چۆکی رەنگی زمروودیە ئەویش زۆر گەورەیە لەبەر دووری زانیاری لەسەر نییە.

لەسەر بازنەی فەلەکی ئەم کۆمەڵە لەگەڵ کۆمەڵی وورچی گەورە بەرامبەر یەکن ئەستێرەی - قوتب- جەدی لە بەیانیاندایە.

ساڵی /١٥٧٠/ زانا تیخۆ ئیبراهیمی ئەستێرەکی رەچاو کردووە لەناو ئەم کۆمەڵە کە تیشکەکەی ئەوەندە زیادی کرد ووە پاشان وونبووە زاناکان دەڵێن تەقیوەتەوە و لەناو چووە پەشماوەکەی بۆتە هەورە ئەستێرە (سەدیم).

## کۆمەڵی ڤرساوس – بەرشاوش

وەێنەکــە لەســوار چــاکێك دەچــیٚ کەســەری دێــوەکی بڕیــوە، ژمــارەی ئەستێرەکانی /٢٦/ دانەیە، ئەستێرەکانی زۆر بەیان گەشە لەهەموان زیاتر ئەستێرەی (مەندۆزا)یە واتە سەری غوڵ. لە دانیشگای – امریکی زانا– هارۆلۆ شابلی پشکنینی لەسەر کردووە پایدەگەینی کە ئەستێرەکی پڕ و شکاویە لەیەك چرکەدا– ٥٠– تا –٦٠– پروسك فریدەدات، لە بەهارو مانگی – اب– زیاد دەکات پڕوشکەکان زۆر بەهێزن لەبەر هەبوونی مەدەی – مەنغەنیز– لەناویا– هەروەها سەلماوە کە دووانەیە لەدەور یکدی خولدەدەن بەماوەی – دوو ڕۆژ –٢١– خولەك وە /١٠٥/ساڵی ڕووناکی دوورە و هەردەم تیشکەکەی لە گۆڕاندایە، گەورەیی لەسەرووی سوورە زەبەلاحەکانە.

دووکۆمەڵە ئەستێرەی – هێشوویی لەنزیك کۆمەڵی ڤەرساوسە یەکیان بەناو (C٨٨٤ ئەوی تر بەناوی C ٨٦٦ کەتەلۆك n-g-c )

**PERSEUS**

صور الكواكب — لابي الحسين الصوفي

# صورة برشاوش على ما ترى في السماء




**Fig. 11.**

**(b)**

**between pages 85 & 86**

**CASSIOPEIA**

صور الكواكب — لابي الحسين الصوفي

صورة ذات الكرسي على ما ترى في السماء




**Fig. 10.**

(b)

between pages 78 & 79

## کۆمەڵی اندرۆمیدە – المرأ ة السلسلة

زاناكان دەڵێن ئەم كۆمەڵە شكلانەیە كەوەكو – كەشكەلانی– رێگای كاكیشان زۆریش بەیەك دەچن وە دووریەكەی بە /٢٢٠٠٠٠٠/ ساڵی روناكی لە قەڵـەمی دەدەن. لەناو كۆمەڵەكە ئەستێرەیەكی زەبەلاحی پڕشنگدار هەیە كەلە ناوەنـدە وەكـو خـۆر، هـەروەها /٢٣/ ئەسـتێرەی تـری دیـاری دیكـەی هەیـە. لـەناو كۆمەڵەكە هەورە ئەستێرەی m٣١ هەیە.

زاناكان دەڵێن كۆمەڵی – اندرۆمیدە– زیاتر لە ١٥٠ كەشكەڵانی لـەدەورە هەیـە لەبەر ئەوە ناو نراوە (عنقود – مجری– كەشكەڵانی هیشوویی).

## کۆمەڵی پێجاوس – ماییـنی گەورە

ئەم كۆمەڵەیە شوێنێكی زۆری داگیر كردووەلە /٢٧/ دانە پێك هـاتووە، كـەزانا فەلەكیەكان ئەستێرەكانی دیكەی پی ڕەچاو دەكەن. لەناو ئەم كۆمەڵە نزیكەی /١٦٢/ سەدیم هەورە ئەستێرەی هەیە كە /١٠٠/ ملیۆن ساڵی ڕوونـاكی دوورن چوار ئەستێرە ناسراوە كە وەكو چوار گۆشەوان لەوانە:

١– مـەتن(پـێش زینـی وولاغ)لەگـەورە زەبەلاحەكانـە /٨٧/ جـار لـەخۆر زیـالترە ڕەنگـی سـوورە گوڵییـە وە دووانەیـە، وەنزیكـەی /٢٠/ ئەسـتێرە لـە دەورەی هەیە.

٢– سوڕە (ناوك) لەگەڵ كۆمەڵی (اندرومیدە)تیكەڵە.

٣– جەناح (باڵ) ڕەنگی سوورو زمرودیە.

٤– مەنكەب لەسەر شەپیلكیەتی. ئەم چوار ئەستێرەیە زۆر گرنگن.(كەتـەلۆج n-g-a) (الكون العمیق ص – ٨٩).

## دوو کۆمەڵی مارو مارگر

ئەم کۆمەڵە لە /٤٢/ ئەستێرە پێك دێت ، کە زۆر بەیان گچکەن لەناو ئەو کۆمەڵە ئەستێرەك تیشکی زۆر بەهێز بو لە ساڵی /١٦٠٤/ پاش چەند رۆژ نەما و بزر بوو، ئەستێرەی سەر وێنەکە زۆر گەورەیە لە جۆری سەروی زەبەلاحەکانە جۆری m٣ تیرەکەی بە /٤٥/ بلیۆن کم مەزندە دەکریٚ، لە کۆنا کراوە بەنیشانەی هەردوو ئەستێرەی گەلاوێژ بەسەر لای راست دا تیپەر دەکات، هەروەها گەلاوێژی شام بەلای چەپ ، بە (نسق یمانی نسق شامی)ناودێرن. دوو کۆمەڵە ئەستێرەی کراوە(العناقد المتفتحە)ی m١٦/m٦٦١١ لەناو کۆمەڵەکە هەیە(الکون العمیق ص ٢٤٣-٢٤٤)

**ANDROMEDA**

صور الكواكب — لابي الحسين الصوفي

كوكبة المسلسلة مع كوكبة السمكة الشمـــالية التي وصفها
بطليوس على ما ترى في السماء

للغرب




**Fig. 20.**
(c)
between pages 132 & 133

**PEGASUS**




**Fig. 19.**
(b)
between pages 122 & 123




Figs. 13 & 14.
(h)
between pp. 103 & 104

## کۆمەڵی ئۆریگا – ممسك الأعنه

ئەم کۆمەڵە لە /١٣/ ئەستێرەیە کەدووانیان لەهەموان گەشترە یەکیان پێی دەڵێن(الحیون– ئۆریگا) گە دووانەیە بەڵام لەبەر دووری وەکو یەك ئەستێرە دیارن، گەورەکە تیرەی بەقەدەر /١١/ ئەوەندەی خۆرە، ئەو یتر نیوەی تیرەی ئەویدییە واتە تیرەی هەردووکیان /٢٦٠/ملیۆن میلە /٥٢/ ساڵی روناکی دوورە، رووناکیان /٥٠/ جار لەخۆر زیاترە.

ئەستێرەی دووەمی سەرشانی ئەویش دووانەیە زۆر لەوانی دیکە گەورەترە دووانەن بە ٢٧– ڕۆژ جارێك لەدەور یەك خولدەدەن، دووری /٣٤٠٠/ ساڵی روناکیە.

دوو کۆمەڵە ئەستێرەی بازنەیی لەناو کۆمەڵەکە دا هەیە کە وەکو منداڵ گەمەدەکەن بەبازنەیی دەستی یەکدەگرن ئەستێرەکانیش بەم جۆرەن ناو نراون (الاطفال المازحین) لە جۆری m٣٨ – m٣٧ ناسراون.

## کۆمەڵی هەڵۆ العقاب

کۆمەڵەکە لە /٩/ ئەستێرە پێك هاتووە، لە کۆمەڵەکانی هاوینە. گەشترین ئەستێرە (النسر الطائیرە) هەڵۆ فرەر کە /١٦/ ساڵی روناکی دوورە دووانەن لەدەوری یەك خولدەدەن بە حەوت ڕۆژ یەکیان لە یەکیان گەورەترو تیشکدارترە. رووناکیەکەیان فیفاویە واتە دەمێك کزن دەمێك شەوق دارن.

کۆمەڵە ئەستێرەی کراوەی هێشووی (العناقید المتفتحە) m١١ لەناو کۆمەڵە ئەستێرەکەیە. لەنێوان کۆمەڵی – مارو مارگر و کۆمەڵی – هەڵۆ – کۆمەڵی تیر (السهم)هەیە کە پێنچ دانەیە و ، کەوتۆتە سەر بازنەی فەلەکی خۆر (الکون العمیق مجامیح الصیف) (جارات الشمس ص ٢٤٣– ٢٤٤–٢٤٥)

## کۆمەڵی دەلفین

کۆمەڵەکە دە دانەیە زستانان باش دیارن لەوێنەی صلیبە – ئەستێرەکیان لای سەری خاچەکەیە زۆر گەورەیە /٢٣٠/ ساڵی رووناکی دوورە، جالەبەر ئەوە زانیاری تەواوی لەسەر نیە. هەر لەنزیك ئەو کۆمەڵە، کۆمەڵی سێگۆشە هەیە – لەچوار ئەستێرە پێك هاتوە، پایزان دەردەکەون.(الکون العمیق مجامیع الخریف والشتاء ص ٢٠٩– ٢٤٤)

## AURIGA




**Fig. 12.**
**(b)**
between pages 92 & 93

صور الكواكب لابي الحسين الصوفي

صورة الدلفين على ما ترى في الكرة




صورة الدلفين على ما ترى في السماء




**Fig. 17.**
**(a & b)**
**facing p. 116**

## کۆمەڵە ئەستێرەکانی باشوور

ئەم کۆمەڵانە کەوتونە باشووری بازنەی – کەلوەکان– تادەگاتە جەمسەری باشوور، هەندێکیان لای ئێمە دیار نین بەڵام لە باشووری هێڵی ئیستوا دەبینرین ئەمەش ناوی هەندەکیانە:–

## کۆمەڵی کیتۆس

ئەم کۆمەلە بەناو گیانلەبەرێکی ئەفسونی کراوە کەلەناو دەریا دەژی ، ژمارەی ئەستێرەکانی /٢٢/ دانەیە، چوار ئەستێرەی پێشەوە لەگەڵ کۆمەڵی – روبار تێکەڵە، ئەوەی سەر سرکەلەی بە– کف الجزماء – ناسراوە واتە: لە پەدەستی گروو.

لەناو کۆمەڵە ئەستێرەی – میرە– هەیە کەزانایانی سەرسام کردووە چونکە جاری واهەیە شەش مانگ بەشەوقە لەناکاو کزدەبێ پێنچ مانگی پێدەچێ،خولدانیشی لە گۆراندایە جار هەیە خێرایە جار هە ستە، رووبەریشی لەزیاد و کەمی یە –زانا– ڤیرکۆس– ئەم نهێنیەی ئاشکرا کردووە، هەروەهادەڵێ:

کە /٤٠٠/ جار لە خۆر گەورەترە شەمو لەیەکی سپی لەدەورەی خولدەدات.

لەناو کۆمەڵەکە – سەدیم– هەر ئەستێرەیە یەکی گەورە هەیە بەناو ٢٥٣ nGCکە /٢٥٣/ روناکی دوورە.(الكون العميق – مجاميع الخريف – ص ٢٠٩)

## کۆمەڵی کەروێشك

ئەستێرەکانی کۆمەڵەکە دوازدە دانەیە، بەعەرشی – کۆمەڵی جەوزا– ناسراوە ئەستێرەیەکی سەر سەرکی بە نیهال ناسراوە کە لەناو تەلەسکۆب وەکو دڵۆپی خوێنە لەبەر دووری زانیاری لەسەر نی یە (صور الکواکب ص ۲۸۳ عبدالرحمان الصوفی)

## CETUS




**Fig. 34.**
**(b)**
**between pages 261 & 262**

## كۆمەڵی جەبار - ئایرۆن

ئـەم كۆمەڵـە بەملیوانكـەی لـوء لـوء ناسـراوە چـونكە هـەر /٣٨/ ئەسـتێرەكەی جوانن

١- ئەستێرەی أ- ب- لەبن باسكی و سنگی زۆر لەیەك دەچن وە لـە سـەرووی سوورە زەبەلاحەكانن تیرەی یەكیان بە /٤٠٠/ ملیۆن كم مەزنـدە دەكریٚ بەلاْم چڕی تەنەكەی‌زۆر كەمە، گەرمیەكەی /٣٠٠٠/ پلەی سانتیگرادە.

٢- رجل الجـوزا- گـوزینگ- ڕونـاكی ئەستێرەكە وەكـو ڕونـاكی ئاسـن لـەحیم كردن وایە ئەوەندە بەهێزە بـەگازی - هایدرۆجین- دەورە دراوە لەیـەك چركە /٨٠/ هەزار تەن ووزە فڕیدەدات، هەروەها دووانەن/٥٠/ سالْی رونـاكی دوورن هـەورە ئەسـتێرەكی زەبـەلاحی لـە نزیكـە كـە پاشمـاوەی تەقینـەوەی ئەستێرەیەكە.

٣- ئەستێرەكانی پشتێنی كە لە كوردەواری بە تـەرازو لەقـەلام دەدریٚ، یەكـەم زیتا-دوانەیە بەشەش ڕۆژ لەدەور یەك خولدەدات قەبارەی زۆر گەورەیە/١٦٠/ سـالْی ڕونـاكی دوورە. دووەم ئەسـتێرەكەی ناوەنـد كـە گـەرمی و شـەوقی لەگۆڕاندایـە - فیفاویـە- ئاسمانـەكی گـازی - زەكۆنیـۆ- تیتـانیۆم- هایـدرۆجین- ی تیدایـە. ئەستێرەكەی دیكە زانیـاری لەسـەر نـی یـە . هەشت ئەسـتێرەی زەبـەلاح بـەڕیز لەسـەر شـیرەكەی هەیـە. هـەروەها - سـدیم (راس الحصان هـەوری سـەرە ئەسـپ) لـەناو كۆمەڵەكـە كـەزاناكان دەڵـێن لەنزیكـەی /٦٠٠/ هەزار ئەستێرەو هەوری تێدایە لەدوو هەورە ئەستێرەو هـەوری تێدایە لە دوو هەورە ئەستێرە پێكهاتووە (الكون العمیق ص ٢٢٣-٢٢٤) (الفلك العام ص ٤٥-٤٦)

(كۆمەڵی شجاع مار ماسی) كۆمەڵی غراب (قەلەڕەش)( كۆمەڵی باطئە) (كاسە) ئەم كۆمەڵانە هەرسێكیان بەیەكەوەن (كۆمەڵی شوجاع) ٢٥ ئەستێرەیە وەكو مار درێژ بوتەوە شوێنیكی زۆری داگیر كردووە لە باشووری هێلی ئیستوا دیارە، تەنها ئەستێرەكی سەر ملی زۆر بەشەوقە. كۆمەڵی (قەلەڕەش) لەحەوت دانە پێكهاتووە، نزیكەی ١٥ پلە لەكۆمەڵی فەریك دوورە. كۆمەڵی (كاسە) حەوت دانەیە ٣٠ پلە لە كۆمەڵی قەلەكە دوورە. هەرسێ كۆمەڵەكە هاوینین.(صور الكواكب / عبد الرحمان الصوفی ص ٣١٤)

## (کۆمەڵانی کووره (مجمره) و چەپکە گوڵ(اکلیل) و (حوتی باشوور) (حوت الجنوب)

١- کۆمەڵی کووره لەخوار هێڵی ئیستوا دیاره وەکو هەورەکی سوور وایە.
٢- کۆمەڵی چەپکە گوڵ وەکو /١٣/ گوڵی رەنگاو رەنگە کەشیان ڕازاندۆتەوە.
٣- کۆمەڵی حوتی باشوور لە هەشت ئەستێرەی ناوەوە و حەوتی دەرەوە پێکدێت یەکی سەر دەمو چاوی لە هەموویان گەشترە /٢٣/ساڵی روناکی دووره.

## (کۆمەڵی سەگی گەوره CANIS MajoR)

ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵە /١٧/ دانەیە، لەهەموان گرنگتر یەك ئەستێرەیە کە پێی دەڵێن – گەلاوێژ- وەچەند ناوی تری هەیە (عبور، الشعرا الیمانی سایرۆس) یەکەم ئەستێرەیە کە ئەو سەرو ئەو سەری ئاسمان دەکات، جالەبەر ئەوە پەرستراوە.

ساڵنامەی میسری کۆن لەسەر ئەو ئەستێرەیە دانراوە، چونکە بەهەلهاتنی ئاوی نیل زیاد دەکات لەبەر ئەوەی چونکە کاتی باران بارینی زۆره لەسەر و چاوەکەی. ناوی مانگەکان بەم شێوەیەیە/ توت/ بابە/ هاتور/ کهیك/ طوبە/ امشیر/ برمهات/ برمۆده/ بشنس/ بەئونە/ أبیب/ میسرا. /١٨/ ی اب سەرەساڵە ئەستێرەی گەلاوێژ لە /١٣/٨/٥/ مانگی ئاب لە کوردستان دەبینری بە پێیی ناوچەکان. گەلاوێژ رووەکەی بە جۆرەها گاز داپۆشراوە/٢٧/ جار لە خۆر پرشنگدارترە، بەخیرایی / ١٧٦٠/ کم لەیەك تروکەدا خولدەدات دووریەکەی (٩) نۆ ساڵی روناکی دووره.

ئەستێرەکە دووانەیە، ئەستێرەیەك لە جۆری (الاقزام البیض ، شەموولە سپییەکان) واتە ئەو ئەستێرانەی ناووکیان نییە یەکپارچەن شەو قوورناکی چڕی تەنەکەیان گەلەك زۆرە (یەك سم ٣ – بەرامبەر یەك تەن قورساییە).
ئەو شەمولە سپی یە بەقەدەر چارەکی گەلاوێژە پێشی دەوتریٚ– ڤان مانین– ئەو شەموولەیە لەدەورەی گەلاوێژ خولدەدات.
زاناکا هۆی برسکانەوەی گەلاوێژ دەگەڕێننەوە بۆ یەکەم گەرمی سەر رووەکەیکە /١١/ هەزار پلەی سانتیگرادە دووەم تێکەڵبوونی ڕووناکی گەلاوێژ و شەموولەکەیە سێیەم غازێکی زۆری جۆراو جۆر. بەهۆی ئەستیرەکانی باشووری گەلاوێژ ئەستێرەی – سوهەیل دیاری بکەن (الکون العمیق ص ٢٢٩-٢٣١) صور الکوکب ابی الحسن الصوفی ص ٢٨٩–

## CANIS MAJOR







Fig. 38.
(a & b)

## (کۆمەڵی سەگی گچکە Csnis - Minor)

ئەم کۆمەڵە لە دوو ئەستێرە پێکهاتووە، گەورەکە پێی دەوترێ گەلاوێژی شام قەبارەی گەورەیە، گەرمی ڕووەکەی /١١/ هەزار پلەی سانتیگرادە، تیشکەکەی فیفاویە دەگۆڕێ لە جۆری f٥ ئەستێرەکی لەدەور خولدەدات جاران کە تیشکەکەی دەگۆڕا دەیان گوت گوایە بۆ خوشکی – گەلاویژ– دەگری کەبەدووای سوهیل کەوتووە دووریەکەی /١١/ ساڵی ڕووناکییە. ئەستێرەکە لەسەر وولاّتی شام تێپەری لەبەر ئەوە بە (گەلاوێژی شام ناودەبرێ)(الکون العمیق ص ٢٣١)

## کۆمەڵی سەفینە–Argo

ئەم کۆمەڵە بەناو پاڵەوانی ئەفسانە– ارگۆ – لای خۆمان سوهیل کراوە کە گوایە بەدووای بەرانی زیریندا دەگەرێ تابیداتە بابی – گەلاوێژ– لەبری مارەیی. کۆمەڵەکە لە /٤٥/ ئەستێرە پێك هاتووە هەندێکیان جووتەن، هەندێکیان گەشن، هەندەکیان کزن. لە ناو هەموو ئەستێرەکان (سوهەیل ناسراوە)ڕەنگی سپیوزەرد لە ئەستێرەی گەلاوێژ گەورەترە، بەلاّم زۆر دوورە، لە وولاّتی یەمەن جوان دیارە. جاران عادەت وابووە ژن لەکاتی منداڵبوون ڕوویان لە ئەستیرەکە دەکرد دەیانگۆ منداڵەکە جواندەبێ(الکون العمیق مجامیع الشتاء ص ٢١٦)

## CANIS MINOR

صور الكواكب    لابي الحسين الصوفي

صورة الكلب الاصغر على ما ترى في الكرة




صورة الكلب الاصغر على ما ترى في السماء




**Fig. 39.**
**(a & b)**
**facing p. 293**

## CENTAURUS & LUPUS

لابی الحسین صوفی      صور الکواکب

صورة قنطورس والسبع على ما ترى في السماء




**Figs. 44.&45.**

**(b)**

**between pages 332 & 333**

## ARGO NAVIS

صُوَر الكواكب — لابي الحسين الصوفي

صورة السفينة على ما ترى في السماء




Fig. 40.

(b)

between pages 302 & 303

لابي الحسين الصوفي

صور الكواكب

# ERIDANUS

صورة النهر على ما ترى فى الكرة




صورة النهر على ما ترى فى السماء




Fig. 36.
a & b

## کۆمەڵی کەنتوری و شێر

ئەم کۆمەڵە لە شێوەی مرۆڤی ئەفسانەیە لە /٣٦/ ئەستێرە پێکهاتوە. کۆمەڵی – شێر– بەتەنها /١٨/ دانەیە ئەوەی گرنگە لیرەدا ئەستێرەی (أ) کەنتوریە کە بەنزیکترین ئەستێرەی وەستاو دادەنرێت لە زەوی، دووریەکەی (٤/٣) ساڵی روناکی یە.

لەنزیك کۆمەڵەکە (سدیم٤٧ تۆکلن) هەیە کە گەورەترین هەورە پانیەکەی بە /٧٠٠/ ساڵی روناکی مەزندە دەکری چ، لەبەر ئەوەی بەرامبەر جەمسەری باشوورە زۆر گرنگە لای ئەستیرە ناسان. (الکون العمیق – جارات الشمس – ص ٢٢٠-٢٢١)

## کۆمەڵی روبار

جاران لە وولاتی میسر چیرۆکی ئاوی – نیل– و فوراتیان واباسکردووە کەسەرچاوەکەی لە مشوێنە دێت لە ئاسمان. کۆمەڵەکە لە /٣٢/ ئەستێرەی وورد کەوەکو روبار دیارە لە ئاسمان دروستبووە. کۆتایی روبارەکە بە ئەستێرەی (زەلچیم کیشەڵی دەریا) کۆتایی دیت کە /٨٠/ ساڵی روناکی دوورە (صور الکواکب ص ٢٧٨ الکونالعمیق ص ٢٠٩)

## ئەستیرەی وەزەکان هەریەکە لەکاتی خۆی

ئەستێرەکان هەردەم لە ئاسمانن بەلاّم بە پێی وەزەکانی ساڵ جیگایان دەگۆڕیّ، جاران هەریەکەی بۆ مەبەستێك دیاری کراون وەناوەکی تایبەتیان هەیە. زۆربەی ناوە ئەستێرەکان بەزمانی یۆنانی یە و بە شێکی کەمی بەزمانی نەتەوەکانی دیکەیە، چونکە شارستانی یۆنانەکان و زانایانیا زۆر لەو بارەوە پێشکەوتوو بوون پێش هەموو وولاّتانی دونیا.

لەناو کوردەواری خۆمان چەند ئەستێرەیەك کراوە بە نیشانە، مەبەستیش ناسینی وەرزو، کاتەکانی کشتوکالّ و کاتی کۆچکردنی گەرمین و کویستان لەلایەن مەرداران لەوانە: ئەستێرەی گەلاویّژ کاتی هەوا فێنکی یە (پیرو) هەلاّتنی نیشانەی هاتنی هاوینە، ئاوابوونی نیشانەی زستانە(دوبران) نیشانەی ئاو کەمی یە (تەرازوو) نیشانەی بەرامبەر شەو ڕۆژە لە بەهارو پایز. هەروەها نیشانەی هاتنی بەهارو پایزە (ڕوانگەی گراو – باشترین بەڵگەی ئەستێرە ناسی یەکە ئەو باسانەی گوتمان ڕوونیان دەکاتەوە).

چوار وێنەی ئاسمانی کە ئەستێرەکانی وەرزەکان نیشان دەکات

## جۆرەها ئەستێرە  مجاميع نجميه

بێچگە لە ئەستێرە گەورەکان ئەستێرە گەڕۆکەکان جۆرەها ئەستیچرەی بەکۆمەڵ هەیە:-

١- کۆمەڵی هێشووی کراوە

* پیرو- لەناو- کەلووی گا

* قەلاس- لەناو کەلووی گا

* m٦  m٧ کە وەکو سنووقی گەو هەرن، هەریەکەیان لە -٨٠ ئەستێرە پیچکهاتووە لە ناو کەلووی دووپشکن

* کۆمەڵی m٣٨ لەناو کۆمەڵی - ذوالعنان.

کۆمەڵی m٤٤ لەکەلووی قرژاڵ

کۆمەڵی m١١ لەکۆمەڵی - العقاب

* کۆمەڵی m٤٤ نزیك بە ئەستێرەی - گەلاوێژ

* کۆمەڵی m٢٩ m٣٩ کۆمەڵی - حاوی و حەییە ئەم کۆمەڵانە هەمووی وەکو هیشووی تری لە تەنیشت یەکن وە زۆر دوون.

٢- (کۆمەڵە ئەستێرەی - خڕ-)

ئەم کۆمەڵانە وەکو بازنە تۆپەڵ تۆپەڵ لە دەوری یەکن وە ژمارەیان گەلی زۆرە.

* کۆمەڵە ئەستێرەی m١٣ لە نزیکەی /١٠٠/ هەزار ئەستێرە دەبێت لەناو کۆمەڵی - الجاثی (هرقل)

* کۆمەڵی m١٢ m٢٢ لەناو کەلووی کەواندان نزیکەی (٥٠) هەزار ئەستێرە دەبن وە /٢٥٠/ ساڵی ڕووناکی دوورن.

٣- کۆمەڵی شەمووله سپی یەکان (الاقزام البض) ئەمانە ئەستێرەی پڕشنگداری بێ ناوکن ، واتە یەك پارچە روناکین، تەناکانیان پیتەوە، یەك سم

٣ موقابیلی یەکتەن قورسایی یە لەسەر زەوی لەدەورەی ئەستێرە گەورەکان خولدەدەن لەوانە

*شەمووڵەی – ڤان مانین – لەدەورەی گەلاوێژ

* شەمووڵەی دەوری ئەستێرەی – ئۆریگا

* شەمووڵەی دەوری ئەستێرەی – جەوزا

* شەمووڵەی دەوری ئەستێرەی – کەنتووری

* شەمووڵەی دەوری ئەستێرەی – جەمسەری (جەدی)

* شەمووڵەی دەوری ئەستێرەی گەلاوێژی شام (الشعری الشامیە)

(الکون العمیق – د. علی الامیر / الکویکیات ص ١٠٩ –١١٠)

Northern Horizon

URSA MAJOR
"BIG DIPPER"
AURIGA
CAPELLA
POLARIS
"NORTH STAR"
URSA MINOR
"LITTLE DIPPER"
BOOTES
ALDEBARN
PERSEUS
CEPHEUS
DRACO
CORONA
BOREALIS
PLEIADES
CASSIOPEIA
SERPENS
TRIANGULUM
VEGA
ANDROMEDA
DENEB
HERCULES
ARIES
CYGNUS
"NORTHERN
CROSS"
LYRA
OPHIUCHUS
SAGITTA
DELPHINUS
PISCES
PEGASUS
ALTAIR
SERPENS
AQUILA
CETUS
AQUARIUS
CAPRICORNUS
SAGITTARIUS
FOMALHAUT
GRUS

Eastern Horizon

Southern Horizon

**The Night Sky In Autumn**




**The Night Sky in Winter**

## ئەستێرە کلکدارەکان – المذنبات

لە نێوان هەسارەی – مەریخ و موشتەری ملیار ها پارچە بەردی بچووك و گەورە هەیە کە لەو ئاسمانە پان و بەرینە بلاْون، سەرەرای ئەمانە چەندین ئەستێرەی کلکدار هەن کە جیاوازن لە قەبارەدا لەو ناوەندەدا دەسووڕێنەوە، ئەستێرە کلکدارەکان سەریان وەکو کوتەك خڕە بەدوای خۆیاندا ملیار ها پارچە بەردی گچکەو گەورە لەگەڵ تۆزو بایەکی خۆڵاْوی ڕادەکیشن، وەبەخێرایی –٣٥–تا–٤٥– هەزار میل لەیەك خولەکدا دەڕۆن، جاروا هەیە لە زەوی نزیك دەبنەوە دەبتە هۆی بەربوونەوەی هەزارەها پارچەی گەورەو گچکە، بەلاْم بەرگە هەوای زەوی وەکو سپیردەبێتە هۆی سوتاندنیان هەر لە ئاسمان.

نەك هەر لەو کلدارانە پارچە بەرد بەرەو زەوی دێن بەڵکو لەدەرەوەی کلکدارەمانیش ئەم پارچە بەردانە لەفەلەکی خۆیان هاتوونەدەر، وەکو زاناکان دەڵێن هۆی لەناو چوونی گیانلەبەرە زەبەلاحەکان ئەو پارچە بەردانە بوون کە لەگەڵ بەزەوی کەوتنیان گۆڕانکاری لەسەر زەوی ڕوویداوە و لە ناو چوون، هەروەها دەڵێن لەوانەیە ڕۆژێك بێت بەردیکی زەبەلاح بەرزەوی بکەوی و کۆتایی بەم شارستانی یە بهێنی. لە قورئانی پیرۆز باس لەوەدەکات کە ئینسان و جنۆکە دەتوانن بچنە وولاْتانی ئاسمان و زەوی بەلاْم بەدەسەلاْتێکی گەورە لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەرکەتوونابن چونکە بەردەباران دەکرێن بەبەردی ئاگراوی و مزاوی، وەڕاستی فەرموودەکەش لیرەدا دەردەکەویٚ کە ئەو پارچە بەردە نیازیکانەی کە دۆزراونەوە هەر هەمووی(کۆبلْتی)تێدایە.(یامعشر الجن والانس ان استطتم ان تنفذوا مَن اقطار السماوات والارض فانفذوا لاتنفذون الابسلطان * ٣٣* سورة الرحمان ) پاشان دەفەرمووێ(یرسل علیکما شواظ

من نار ونحاس فلاتنتصران*٣٥ سوره الرحمان). هەتا ئيستا نزيكەی جيگای /٧٠/ نيازيك لەسەر زەوی دەست نيشان كراوە.

لە ئەفريقيا گەورەترين شوێن دۆزراوە كەتيرەكەی /٨٧/ ميلە. هەروەهالە ولاتی – ئەريزۆناجێگای نيازكيك هەيە كە پێش /٥٠/ هەزار ساڵ خۆی بەوشوێنەدا كێشاوە پانی دووميل و قوڵی /٥٠٠/ پی يی لەساڵی ١٩٠٨ پارچە نيازيكەك لەسێبەريا كەوتە خوار. لە ئەڵمانيا شوێنی يێكی ديكە دۆزراوە كە زۆر كۆنە تيرەكەی /١٤/ ميلە ئەمەش ناوی هەندی لە ئەستێرە كلكدارەكانە:

١- هالی – كە /١٠٠/ مليۆن ميل درێژ/٦٠٠/ كم پانە ئەدمۆند هالی- ڕەچاووی كردوە بە /٧٦/ ساڵ يان /٧٢/ ساڵ جارێك دەردەكەوی چ. لەساڵی /٦٦/ زايين بەسەر قودس تێپەری كردووە، لە ١٧٥٦ جارێكی ديكە بينرا. لە ئەفريقا لە ساڵی ١٩٠٩ – ١٩١١ بينراوە.

٢- جاكۆبينی – ماوەی دەركەوتنی ١٣- ساڵە لە ١٩٣٣ لەماوەيەكی زۆر دوور بينراوە.لەساڵی ١٩١٦ –و- لە زەوی نزيك بۆوە هەزار پروشك داباری بەسەر زەويدا.

٣- بيلۆلاس- بەشەش ساڵ و چوار مانگ دەردەكەوێ.

٤- ئانكی – بەسێساڵ و چوارمانگ خولگەيەتی.

٥- برۆك- ساڵی ١٩١١ لەدوور بينراوە.

٦- تامبلْ- خوڵگەكەی -٣٣- ساڵە ، لەسالی ١٩١١ زۆر لەزەوی نزيك بۆتەوە پروشكەكانی وەكو باران بەر زەوی كەوتوون زەرەری گەڵێ زۆر بوونە. لەگەڵی سورەتی قورئان بەر زەوی كەوتوون زەرەری گەڵێ زۆر بوونە. لەگەڵێ سورەتی

قورئـان باسـی ئـەو نیازیکانـە کـراوە.(مجلـە العلـوم، ع ٢٢ الکـون العمیـق ص ١٠٥،١٠٤،١١٧،١١٣،١١٢، المذنبات، الشهب والنیازك ، علی الامیر).

ئیستا بۆمان دەردەکەویٚ کە ئەم هەموو نیازیك و پەڵە بەردانە هەر هەمووی لە ئاسمانی زەوی یـە ، گـەر وەهـا دەرکـەویٚ کـە ئاسمـانی تـریش هەیـە خـودای مەزن لـەم ئایەتـە بـەجوانی دەری دەخـات (ولقـد زینـا الـسماء الـدنیا بمـصابیح وجعلنا هارجوما للشیاطین* الملك -٥- قورئانی پیرۆز)

# کەشکەڵان و هەورە ئەستێرەکان

خودای مەزن دەفەرموێ(واالسماء بنيناها بايد وانا لموسعون*الذاريات -٤٥) واتە ئاسمانەکانمان دروست کردووە وەهەر گەوریان دەکەین. ئەگەر ئێمە راپۆرتی زاناکان بخوێنینەوە بۆ مان دەردەکەوێ کە ئاسمان چەندە گەورەیە، کەنزیکەی /٣٠٠/ ملیار کەشکەڵان رەسەد کراوە کەهەر یەکەیان نزیکەی /٣٠٠/ ملیۆن ئەستێرەیان تێدایە، بێجگە لە شوێنی تاریك و هەورە ئەستێرەو، ئەستێرەی گەورەو گچکە و کلکدارو ئەستێرەی کوژاوە.

هەندێ نمونەی ئەمانە ڕووندەکەینەوە:

١- کەشکەڵانی - ریگەی کاکێشان(درب التبانه) هەرمیلەتیك بە جۆرێك ناوی بردووە. تیرەکەی /١٠٠/ هەزار ساڵی رووناکی یە (باسمانکردووە)

٢- کەشکەڵانی- ئەندرۆمیدە- کە /٢٢٠٠٠٠٠/ ساڵی روناکی دوورە وەهەزاران کەشکەڵانی تری لەدەور هەیە بە شێوەی ڕێگای کاکیشان دەچێ ناوەندی رووناکە لەوانەیە ژیانێکی تر هەبی لەناویدا خودای مەزن دەفەرمووێ(الله الذى خلق سبع سماوات ومن الارض مثلهن يتنزل الامر بينهم* الطلاق -١٢) وەلە زۆر جێگەیدی باس لەوە کراوە کە حەوت ئاسمان و حەوت زەوی هەیە بەڵام هێشتا زانست ناتوانی هەموو شتیك ڕوون بکاتەوە.

بەڵام هەورە ئەستێرەکان ژمارەیان گەلی زۆرە ئەوەی رەسەد کراوە:

١- هەوری - سەرە ئەسپ له کۆمەڵی - جەوزا

٢-هەوری ژمارە /٧٦١٩/ کە بەخیرایی /٢٢٤٨/ میل لەیەك تروکەدا خولدەدات /٢٥٠/ ساڵی روناکی دوورە.

٣- هەوری ژمارە /٢٥٣/ کۆمەڵی - کیتۆس

٤- هەورەی ژمارە /٥٨٤/ لەلایەن (مرصد بیلومغتین - جنوب افریقا) کە بەخێرایی /١١١٨/ میل لەیەك تروکەدا خولدەدات، ئەستێرەی - نۆڤا بەکتریۆس، لەناو هەورە کەیە شەوقەکەی دەهەزار جار لەخۆی زیادی کردووە. سەرئەنجام تەقینەوە لەسەر ڕووەکەی ڕوویدا توێکڵی سەرەوەی بووە غوربار.

٥- هەوری ماجەلان- کەماجەلان وەختی خۆی لە گەشتەکەیا باسی کردبوو، زاناکانیش بەدووا داچوونیان ئەنجامدا دەرکەوت /١٧٠/ هەزار ساڵی ڕووناکی دوورە، لە دووبەش پێکهاتووە گەورەکەیان ناوناوە(السمك الذهبی) هەورەکە/١١٠/ ساڵی ڕووناکی پانە /٣٠٠/ هەزار جار لە خۆر گەورەترە.

٦- هەوری (٤٧ تۆكڵن) كە /٩٥/ هەزار ساڵی ڕووناكی دوورە، تیرەی /١٨/ ساڵی روناكیە، نزیكترین هەورە لەجمسەری باشوور(كەتەلۆك GNC) هەندێ هەوری تر كەزانیاریان لەسەر نییە:

١- هەورە ئەستێرەی كۆمەڵی – فەریك/١٦/ دانە دووریان /٦/ ملیۆن ساڵی ڕوناكی .

٢- هەورەكانی كۆمەڵی پیرانس /٨٠٠/دانە دووری /٥٠/ ملیۆن ساڵی ڕوناكی كۆمەڵی – پیرانیس بەرنیقە لەووڵاتی میسر دیارە وەكو پرچێكی زیری كراوە پەرشبووە. چیرۆك وادەگێرتەوە: لەسپرانیس ژنی فیرعەوی میسر پرچێكی زۆر جوانی هەبووە كە هەردەم چەند كەس خزمەتیان كردووە بە یاقووتو مرواری رازاندویەتەوە فیرعەون دەچێتە شەرێ ژنەش پرچەكەی دەكاتەوەنەزەر بۆ پەرستگا كەفیر عەون سەركەوێ، بەڵی فیرعەون سەركەوت ژنەش پرچەكەی بڕی و دایە گەورەی شوێنەكە، ماوەیەك پێچوو ژنە ویستی پرچەكەی ببینی بەڵام گەورەكە پێیگوت وەرە ئیمشەو تەماشای ئاسمانكە لەوێ دامناوە! هەوری پیرانیشی پیشاندا، بەم جۆرە هەرچی متو مۆری گران بەها هەبوو لووشی كرد.

٣- هەورەكانی كۆمەڵی – برشاووش/٥٠٠/ هەریەكەیان دووپلەی ئاسمانی گرتووە بەتەنیشت یەكەوە، دووریان /٣٦/ ملیۆن ساڵی روناكییە.

٤- هەورەكانی كۆمەڵی وورچی گەورە /٥٠٠/ دانەیە دووریان /٧٢/ ساڵی ڕووناكی یە

٥- هەورەكانی كەلوی – گا– یەكیان بە (سدیم السرطان ناسراوە) ژمارەیان /١٥٠/ دانەیە /٢٩/ ساڵی روناكی دوورن

٦- هەورەكانی كۆمەڵی – پێجاووس– ژمارەیان /١٦٢/ هەورە دووبەشن بەشیكیان /١٠٠/ ملیۆن ساڵ وەبەشیكیان /٢٤/ ملیۆن ساڵ دوورن (الفلكا

العام هير سپينسرت- عبدالحميد سماحه ص -١٠٧ الكون العميق ص ١٢١ - ١٢٢ مجله الدوحه ١٩٨٦ ص ١٦-٤٢ ).

## شوێنه تاریکەکانی ئاسمان (الثقوب السوداء )

تازانیاری پێش دەکەوێ زانیاری زیاتر دەردەکەوێ، زاناکان بۆیان روون بۆتەوە کە لە ئاسمان ئەستێرەکی زۆری تاریك هەیە کە ملیارد ها ساڵە کوژاوەنەوە وەهەر ماوون وەنابینرین چونکە چاوی مرۆڤ تیشکەکان نابینی وەکو ئەوەی کەلەبەر چاومانە بە پێچەوانەکردن ئەبینی، بەلأم چون زاندراوە کە ئەم ئەستێرانە هەن ئەم زانیاریە بەهۆی شەپۆلی رادیۆمی زانراوە کەبەر ئەو ئەستێرە کوژاوانە دەکەوێ دەگەرێتەوە.

بێجگە لەمانە ملیارەها شوێنی تاریك لە ئاسمانەکان هەیە کە هیچ زانیاری لەسەریان نی یەچونکە شەپۆلی رادیۆمی قووت دەدەن، سەیر لەوەدایا کە ئەم کونەتاریکانە ئەستێرەکی زۆریان لەدەور هەیە هەمووی چاوەروانی قووتدانن وەزاناکن دەڵێن ئەم شوێنانە گۆرستانی ئەستێرەکانن(مقبره النجوم) هەریەکە ئەستێرەی لینز یکدەبێتەوە یەکسەر قووتی دەدات. شوێنێك لەناو ریگای کاکیشان هەیە زاناکان دەڵین لەوانەیە سەدان ئەستێرەی وەکو خۆر قووتدا بێت. زاناکان دەڵێن مادە لەناو ناچێ بەلأم لەشکلکەوە دەگۆرێ بۆ شکلیکی تر لەسەر ئەو بۆ چوونە دەڵێن ئەو ئەستێرانەی دەکەونە ناو تاریکی نافەوتێن بەلکو لەلایەکی تر دینەوەدەر و گۆرانیان بەسەردادی. بەراستی ئەم شوێنانە زۆر سامناکن وەخودای مەزن ئیشارەی پێ کردووە کە دەفەرمووێ (او کصیب فی السماء فیه ظلمات ورعد و برق * بقره ١٩) الکون العمیق ص ١٤٠-١٤١

## لەناو چوونی ئەستێرەکان و پەیدابوونی ئەستێرەی نوێ
## NOVa

زانایانی ئەستێرە ناسی لەو باوەڕەدان کە کات نیە کە ئەستێرەکی نوێ لەدایك نەبێت وە ئەستێرەك نەمرێ وەچەندین بۆ چوونیان هەیە لەو بارەوە.

١- شەمووڵەی سپی یەکان کەلەدەرەوەی ئەستێرە گەورەکان دەسوڕێنەوە وورده ووردە شەوقو ڕووناکی لە ئەستێرە گەورەکە وەردەگرن ساڵ بەساڵ گەرمی و ڕوناکی زیاد دەکات بەرگە ناگرێ وە دەتەقێتەوە وەلەپاش خۆی غازاتو پەلەبەرد و دووکەڵێکی زۆر پەخشدەکات.

٢- بۆ چوونی دووەم ئەوەیە کە ئەستێرە زەبەلاحەکان پیر دەبن بە تێپەڕینی ملیار هاساڵ جەلەبەر ئەوە هێزی موغناتیسیان لەدەست دەدەن و پاڵە پەستۆی گرمی ناویان زیاد دەکات، وەدەتەقێتەوە. ئەستێرە ناسان زۆر شتی سەیریان لە بارەوە ئاشکرا کردووە، وەکو لەو ڕووداوە تۆمار کراوانە دەرکەوی:

١- لەساڵی ١٨٨٥ تەقینەوە لە کۆمەڵی – ئەندرۆمیدە ڕوویداوە.

٢- لەساڵی ١٩١٨- لەکۆمەڵی – هەڵۆڕوویداوە.

٣- لەساڵی ١٩٣٤- لەکۆمەڵی – هەرکۆلیس.

٤- لەساڵی ١٠٥٧٢ –لە کەلووی گا (سدیم الرطان).

٥- لەساڵی ١٥٧٢ لە کۆمەڵی – کسیوپیا ڕوویداوە.

٦- لەساڵی ١٦٠٧ لەکۆمەڵی – حاوی دلفین ڕوویداوە.

(هندسه النضام الكونی فی القرئان الكريم – عبدالعليم عبدالرحمان)

(مجلەتايم اللندنيه)(الموسوعه العلميه الحديثه والحيه – ڕوویداو)

٧- لەساڵی ١٩٦٧ لەکۆمەڵی

٨- لەساڵی ١٩٥٧ – زانا شیلتۆن (جامعة کمبریج)تەماشای هەوری ماجەلانی دەکـرد لـەو کاتـەی کـە ئەسـتێرەیەکی نـاوی زۆر پڕشـنگدار ببـوو، لـەناکاو تەقیەوە زاناکان دەڵێن هێزی رشوناکی کەی بەقەدەر/١٠٠/ ملیۆن روناکی رۆژ بووە.

سەرچاوە سەرەکییەکان

١- بدائع السماء - جيرالد هوكنز ترجمة عبد الرحيم البدر
٢- دليل السماء والنجوم - وزارة الثقافة والإعلام
٣- النجوم في مسالكها - ترجمة أحمد عبد السلام
٤- القاموس الفلكي - حنا جرداق
٥- أسرار الكون - ترجمة نسيب وهيبة
٦- الكون العميق د. علي الأمير
٧- الكون العجيب منصور حنا
٨- تفسير الجواهر - البيضاوي - جلالين
٩- مجلة العربي عدد ٢٨٧ - ١٩٨٢
١٠- [illegible] ١٩٨٥ - طبعة [illegible] - ٢٨٤
١١- تاريخ علم الفلك عباس العزاوي
١٢- مع النجوم في تطورها - جون لويس - ترجمة صلاح حامد
١٣- عجائب السماء - حنا جرداق
١٤- الانفجار الكبير - أورخان محمد علي
١٥- صور الكواكب - أبي الحسين الصوفي
١٦- الأطلس المدرسي والعالم
١٧- الفضاء والشهب - محمد فتحي عوض الله
١٨- مآثر العرب في الرياضيات منصور حنا
١٩- الآثار الباقية في القرون الخالية - البيروني - الخوارزمي
٢٠- روانگە کوردییەکان
٢١- السماء في الليل - [illegible] - ليونيد - تأليف [illegible]
٢٢- الفلك العام - هربرت سبنسر - د. عبد الحميد سماحة
٢٣- الكون والثقوب السوداء رؤوف وصفي
٢٤- مجلة [illegible] - الكويت
٢٥- مجلة العربي - ثقوب في السماء - سوداء وبيضاء عدد ٢٨٧ سنة ١٩٨٢ - دكتور عبد المحسن صالح

